Weşanên APEC

Weşan no: 86

# GULÇINÎNEWE

Le xermanî "Henbane Borînê"y Hejar

Çapa yekemîn: Stockholm 1995

Nivîskar:

Abdullah Hasanzade



Navnîşana xwestinê:
Box 3318, S-163 03 Spånga/ Sweden
Tel: +46 8 761 81 18 * Fax: +46 8 761 24 90

ISBN: 91-87730-86-3

**APEC**

# دەربارەی ئەم نامیلکەیە

سالی ۱۹۹۰ فەرهەنگی کوردی ـ کوردی ـ فارسیی « **هەنبانە بۆرینە** » لە نووسینی نووسەر و شاعیر و کوردی زانی بەناوبانگی کورد مامۆستا هەژاری موکوریانی بلاو بووەوە و کەلێنێکی گەورەی لە کتێبخانەی کوردی دا پڕ کردەوە . بێ گومان زمان زانان و فەرهەنگ نووسان لەسەر فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە هێندێک تێ بینی یان هەیە و رەنگە بەشێکیشیان زۆر لە جێی خۆیان دا بن. بەلام پێم وابێ کەس نکوولیی لەوە نیە کە فەرهەنگەکەی مامۆستا هەژار نەک هەر تەواوترین فەرهەنگی کوردی یە کە تا ئێستا بلاو کراوەتەوە ، بەلکوو بە تەنیا زیاتر لە هەموو فەرهەنگەکانی پێش خۆی وشەی کوردی لە دوو تویێی بەرگەکانی دا جێ کردۆتەوە .

زۆر پێش دەرچوونی هەنبانە بۆرینە مامۆستا بە نامە ئاگاداری کردبووم کە بە نیازە ئەو دیاری یە بەنرخە پێشکەشی خوێنەرانی کورد بکا و تەنیا مانگێک پێش دەرچوونی بەرگی یەکەمی فەرهەنگەکەی بۆی نووسیبووم : « *لەم بەینەدا جزمی یەکەمی فەرهەنگەکەم چاپ کراوە و قەرارە جزمی دوهەمیش چاپ بکرێ . بە هومێدم بەم زوانەجزمی یەکەمت*

پێ بگا . بۆیە نالێم پێو بگا ، مەنظورم ئەمەیە کە تۆ بەوردی لێی هەڵدەروانی جا ئەگەر تووشی شتێک هاتی کە لای تۆش بەو مانایە شتێک هەبو ، من نەم نوسیبو، لای خۆت یادداشتیان بکە.چونکە ئەوە یەکەمین کارە لەم بارەوە وا بە پان و بەرینی دەس پێ کراوە . بەلام ناتوانم بێژم سەری گیراوە . بە هومێدم ببێتە بناغەیەکی فەرهەنگی دوارۆژمان و دیارە دەبێ هەرکەس دەتوانێ لە بەر خۆیەوە هەوڵی بۆ بدا و تەواوی بکەن » .

کاتێکیش بەرگی یەکەمی بە دیاری بۆ ناردبووم لە پێشکەش کردنەکەی دا ئەو داوایەی دووپات کردبۆوە کە بیخوێنمەوە و ئەگەر تووشی شتێک هاتم یادداشتی بکەم و بۆی بنێرم . لە سەر داوای مامۆستا و هەروا بۆ ئەوەی بەڵکوو شتێکی لێ فێربم بەرگی یەکەمی هەنبانە بۆرینەم خوێندەوە و ئەوەی بەرچاوم کەوت یادداشتم کرد و لەگەڵ نامەیەک بۆم نارد. دیار بوو مامۆستا تێ بینی یەکانی منی بە دڵ ببوون. بۆیە لە وەلامی نامەکەم دا نووسیبووی : « ئەو نامەی دواییت کە بە چەندین وشەی بەنرخەوە ناردبوت پێم گەیشت . زۆر زۆر سوپاست دەکەم . بە داخەوە تا ئێستا بەرگی دوهەمی هەنبانە بۆرینە لە چاپ دەرنەچوە و کردویانەتە هاتەهاتی رۆمێ ، هەر دەڵێن ئەم حەفتەیە نا حەفتەیەکی تر. بریا دەرچووبا و کارێکم بکردایە بۆتی بنێرم. ئەو دەمیش دیسان چاوەنۆرم زۆر بە وردی لێی ورد بیەوە و تێ بینی و تازەکانی خۆتی بخەیە سەر » .

زۆر بە داخەوە پێش ئەوەی بەرگی دووهەمم پێ بگا ، مامۆستا هەژار مالاوایی لێ خواستین و داخێکی گەورەی لە سەر دلی هەموو ئەویندارانی پێشکەوتنی زمان و ئەدەبیاتی کوردی دانا. بەو حاڵەش هەر لەسەر وەسیەتەکەی مامۆستا بەرگی دووهەمی هەنبانە بۆرینەم خوێندەوە و تێ بینی یەکانی خۆم لە سەر یادداشت کرد. بەلام ئەوی راست بێ چونکە دەم زانی ئەم جارەیان مامۆستا نای بینێ ، زۆر لێی بەگور نەبووم و لە ئاکام دا زۆریشم شتی تازە بە بیردا نەهات .

با لێرەدا ئەوەش تۆمار بکەم کە بە هاسانی دەتوانم بڵێم ئەوەی لە هەنبانە بۆرینەدا هاتوە، لانی کەم ۳۰٪ی بۆ من تازەیە ونەم بیستوە و ئێستاش فێری نەبووم. بەڵام بەهەر حاڵ زەینی بنیادەم کۆمپیووتەر نیە و مرۆڤ هەرچەندی زۆریش بزانێ کاتێک زانراوەکانی دەخاتە سەر کاغەز، هێندێ شتی لە بیر دەچێ . هەر بۆیەش یەکی وەک من توانیویەتی شتێک بخاتە سەر گەنجینەی هەنبانە بۆرینە .

بەهەرحاڵ، ئەو شتانەی یادداشتم کردبوون هەروا مابوونەوە و نەم دەزانی چی یان لێ بکەم . تا ئەم دوایی یانە برادەرێکی زۆر نزیکم پێشنیاری پێ کردم ئێستا کە دەرفەتی ئەوە لە کیس چووە بۆ مامۆستایان بنێری ، بۆ خۆت بە جیا چاپیان بکە و بڵاویان بکەوە. ئەگەرچی بەش بەحاڵی خۆم شتەکەم زۆربەلاوە نابووت و کاڵ وکرچ بوو، بەڵام ئەو برایەم هێندەی لێ دووپات کردمەوە کە قبووڵم کرد چاوێکی پێدا بخشێنمەوە و ئامادەی بکەم بۆ چاپ . ئێستاش کە ئەم دێڕانە دەنووسم هیچ دەروویەکی روون بۆ چاپ و بڵاو بوونەوەی شک نابەم ، جا بزانین چارەنووسی بە کوێ دەگا .

لە سەر ئەم نامیلکەیە دوو شتی پێویست هەیە کە باسیان بکەم :

١ـ هەنبانە بۆرینە فەرهەنگی کوردی ـ کوردی ـ فارسی یە. بەڵام ئەو وشانەی ئەمن زیادم کردوون ( لە چەند جێ یەک دا نەبێ ) تەنیا بە کوردی مانا کراونەوە . هۆیەکەشی ئەوە بوو کە لە کارەکەم دا بە تەنیا بووم و نەم توانی بەرامبەری هەموویان لە فارسی دا بدۆزمەوە. بۆ خۆشم لەو کەسانەم کە لە کوردییش دا رقم لە وشە داتاشین دەبێتەوە . بۆیە حەزم نەکرد بۆ فارسی وشە داتاشم.

٢ـ ئەو وشانەی لەم نامیلکەیەدا بەرچاو دەکەون سێ دەستەن : یەکەم ئەوانەن کە لە هەنبانە بۆرینەدا نەهاتوون . ئەمانە نووسراون و مانا کراونەوە و هیچ شتێکیان لە بەردەم نەنووسراوە . دەستەی دووهەم ئەو وشانەن کە لە هەنبانە بۆرینە دا هەن ، بەڵام لە کوردی دا مانای

دیکەشیان هەیە ، جگە لەوانە کە مامۆستا هەژار بۆی هێناون . ئەم جۆرە وشانە پاش مانا کردنەوە ئەم نیشانەیە ( + ) یان لە پێش نووسراوە . سێیەم دەستە ئەوانەن کە بە باوەڕی من ماناکەیان لە فەرهەنگەکەی مامۆستا هەژار دا بە دروستی لێک نەدراوەتەوە . لە پێش ئەو جۆرە وشانەش نیشانەی ( × ) دانراوە . دیارە ئەگەر وشەکانی ئەم دەستەیە بەو مانایەش هەبن کەمامۆستا لە هەنبانە بۆرینەدا بۆی داناون ، ئەودەم دەچنە پاڵ دەستەی دووهەم . چونکە لەو مانایانە کە بۆم داناون بە تەواوی دڵنیام .

هەرچۆنێک بێ فەزل و گەورەیی و هونەر بۆ مامۆستا هەژارە و ئەوەی من بە زەحمەت دەکرێ ناوی پاشەرۆکیشی لەسەر دانرێ . بەو ئاواتەم کە ئەم کارەش خزمەتێکی بچووک بە دەوڵەمەند بوونی زمانی کوردی و فەرهەنگی کوردی بکا .

نووسەر
١٩٩٤/١٠/١

# پیتی ئـ

ئاختفی : کەچەڵێک کە هەموو سەری برینە .
ئادار : شوێنەوار:( *ئاداری بەسەر پادارەوە نەهێشت*).+
ئاردە برنج : برنجی هاڕراو.
ئاردە توو : تووی وشکی هاڕراو.
ئاردە نۆک : هاڕراوی نۆکی برژاو.
ئاژنە : دارێکی کورتەباڵای قژنە، سەر سوانەی خانووی پێ دەگرن.
ئاسنگەر : وەستای دروست کردنی ئامرازی ئاسنە. وەستا خاڵە تایفەیەکن ، نەک هەموو ئاسنگەرێک .×
ئاسێ : چیای سەخت و ئاستەمە، ( واتە صعب العبور نەک مرتفع ).×
ئاشبەتاڵ : بارانی باراش لە ئاش.+
ئاشەبەتەندوورە: گەمەیەکی منداڵانە. دەستەیەک بە پێوە سەر پێکەوە دەنێن، یەکێش بە سەریانەوە دەگەڕێ . دەستەیەکی دیکە هەوڵ دەدەن سواریان بن. ئەگەر وەستای دەستەی یەکەم شەقی لە

یەکێکیان هەڵ دا،یان دەستی لێ دا ئەوان دادەبن و دەستەی یەکەم سوار دەبن.

ئاغلاغ : سەرئاوەلا.

ئاگرکەوتنەوە : سووتمان، ئاگر لە وڵات بەربوون.

ئاللۆری : ئەو میشەنگوێنانەن کە لە گەلێ هەڵ بڕاون و نازانن روو لە کوێ بکەن.

ئاللۆری : بریتی یە لە بنیادەمی گەللۆر و بێکارە.

ئالەزۆک : دارێکە لە گۆی چۆمان دەڕوێ و وەک لاولاو لە داری دیکە دەهاڵێ.

ئاوجا : دوو ژن کە هەریەکەی ژنی برایەکن :( غەمی مەوێ یە ، پڕ بە ئەسکوێ یە. غەمی *ئاوجایە* ، پڕ بە دنیایە ) « فۆلکلۆر » .

ئاو دان : ئاو دەلاندن : ( *کەوشەکەم ئاوی دەدا* ).+

ئاو دان : ئاو لێ دەرچوون:( *سەماوەرەکە ئاوی دەدا* ).+

ئاوسێ : دراوسێ، جیران.

ئاوەڕۆ : سنووری نێوان دووکێڵگە ئەگەربەرزایی بێ: ( *هەرچی ئاوەڕۆی بەم دیودایە هی تۆیە* ).

ئاوەڵ مندالْ : پزدانی ژنە زاو.

ئاوێژە : زەوی یەکە ئاو درابێ بۆ کێلان، نەک زەوی یە بەراو.×

ئایسان : درێژەی سووتانە نەک داگیرسان:( *چراکە هەتا بەیانی ئایسا* ) داگیرسان یەکەم هەڵکرانە.×

ئم : بەڵێ.

ئۆردووبەز : ئەو جێگایەیە کە هۆردوو پێی دا دەڕوا، نەک

ئەو جێ یە کە لێی دەمێنێتەوە . ×

**ئەبرەش :** لە تینوان وشک هەڵاتوو :( ئەمڕۆ ئەبرەش یان هەبرەش بووم ) . +

**ئەبلە خەرج :** ئەوەی بێ جێ خەرج دەکا، (مُسرف).

**ئەح ئەح :** دەنگ دانی کاروبەرخ بۆ هاوێر و لێ خوڕینە.×

**ئەحمەدڕاوکەر :** باڵندەیەکی بچووکە ، لە چۆلەکە گەورەترە.

**ئەخترمە :** ئەسب و بارگینی بەرەڵا کراو.

**ئەڕبە :** ربە، پێوانەیەکە دوو کیلۆ گەنم دەبا.

**ئەڕمان :** رمان، رووخان.

**ئەرمەنی :** هەرمەنی، قەومێکن.

**ئەزرەت :** حەسرەت : ( *هێشتا لەسەر* لانکە بە ئەزرەتم بی بینم ). « فۆلکلۆر »

**ئەژگەڵ :** هەژگەڵ، لکەداری بەگەڵاوە کە بە خۆیان و لۆدە کایەوە دەنێن، با نەی با.

**ئەسپەشێرە :** باڵندەیەکە هێندی کۆترەبارێکە دەبێ، خوێندنەکەی وەک حیلەی ئەسب دەچێ.

**ئەسپێ :** جانەوەرێکە گەنمی کۆن هەڵی دێنێ.+

**ئەستان :** زستان، زمسان، ئاخر فەسڵی ساڵ.

**ئەستوورکان :** ریسی ئەستوور وەک خاوک و فرێت و سێتا، دژی باریکان .

**ئەستۆ کورد :** ملە قۆتە، ملە قۆچە.

**ئەستەمبووڵی :** چێشتێکە بە برینج و گۆشت لێ دەنرێ.+
قاپێکی گەورەیە بۆکاری بەننایی قوڕ وسیمان و گێچی پێ دەکێشن .

**ئەستیلان** : ناوە بۆ ژنان.

**ئەستیۆڵک** : ئەستیۆرک، ئاسنێکی دەم پانە هەویری پێ لە تەشتی نانی دەکەنەوە.×

**ئەسلان** : ناوە بۆ ژنان.

**ئەشک** : لاق و دەستی کورت :( ئەشکی کورتن ، *واتە لاق و دەستی کورتن* ).

**ئەناز** : فریدەر :( *خاکە ناز*).

**ئەنگوتکە** : جۆرێک ترێ یە.

**ئەنگۆرە** : نێوان رۆژئاوا و ماڵ نووستنانە، نەک پێش رۆژئاوا .×

**ئەوێندەرێ** : ئەوێ.

**ئێچک** : هێچک، دارێکی سەربە قولاپە لە سەری گوریسی دەبەستن.

**ئێچک** : ئێسکی نێوان ئەژنۆ و سمی بزن و مەڕ دوای خوران.

**ئێخ** : برۆ ، دەنگدانی بزنە.+

**ئێشک کردن** : وشک بوونی ئاوی کانی :( کانی یەکە وشکی کردوە ).

**ئێشکەپەڕ** : رەحەت بوون بە خۆپێوەنانی ژن ـ بێ گان کردن ـ .

**ئێشکەجوو** : نان بە وشکی خواردن.

**ئێشکەشۆر** : ئەم دیو ئەو دیو کردنی دەسرە و پێچ بۆ ئەوەی دیوی خاوێنی وەدەرکەوێ.

**ئێشکەشیو** : ئێشکە شۆر.

**ئیشکه مەڵه** : مەڵەکردنی ئەو کەسەی تازە ژنی هێناوە بێ ئەوەی بووبێ بە زاوا.

**ئیغفاڵ** : فریودان :( بە قسەی خۆش ئیغفاڵی کردم ).

# پیتی ب

**باپزوو** : ئەو بەفرمیە کە با هەڵی دەگریٚ و لە لا باسکان سوانەی پیٚ دەکا.

**باتمان** : ٢٦ ( بیست وشەش ) کیلۆیە. شازدە کیلۆ و نیو پووتە نەک باتمان.×

**باجی** : زڕدایک.+

**باخۆش** : منداڵی لە حەوت هەشت ساڵ بەرەوژوور ، باوخوش.

**بادرەوش** : کون و کەلێنی خانوو کە بای تێڕا بیٚ.

**بادی** : دەفری لە دار دروست کراو.+

**باران دادان** : باران دەلاٌندنی چادر.

**باران کوت** : شوێنێک کە باران کوتاویە.

**باریەها** : بن پشک، ئەو کچەی دانراوە براکەی بە ژنی بدا :( *ئامین باریەهای عەلی یە* ).

**باڕژن** : بارانی بە غوڕەم و لەنەکاو.×

**بارسووکی** : کەم بوونی کەل وپەلی نێومالٌ : ( *بارسووکم و بۆ هەرکوێ پێم خۆش بیٚ دەتوانم بچم* ).

**بارقورس** : بـارگـران، ئـەوەی نـێومــالّی زۆرە: ( هێند *بارقورسم بارناکرێم* ).

**باڕن** : ئەو شوێنە کە باگرە و بەفری پێوە نامێنــێ : ( *بە با ڕنان دا دەڕۆم* ).×

**بارنەبەر** : ولاغی بارنەبەر و زەلامی کارنەکەر.+

**باریک وبنیسی**: لەڕیوون لە ئاکامی نەخۆشیی کۆن دا ، دەغەزدار بوون.×

**بازبازێن** : بە باز ڕۆیشتن.+

**بازوو** : ئەسپ یا ماینێ کە ئەڵقەیەک مووی سپی لە لاقی دا هەبێ.

**باسکە ملە** : پیلەوار، دارێکی ئەستوورە کە بۆ سووتاندن لەسەر شانی دادەنێن و دەیهێننەوە ماڵێ.

**باسکە مەلە** : مەلە باسکە، جۆرێک مەلەیە.

**باسەر** : ڕەشەبا، زریان ، بای ژووروو.×

**باشقە** : هەڵکەوتە، یەکە: (*باشقە باشقەی مەنگوڕان هاتبوون* ).

**باش وەستا** : وەستای باش، وەستاکار، سەروەستا.

**باقلاوا** : تێ گوشینی ڕۆن و دۆشاو.

**باقۆ** : بەرێکی هەنجیرە کە بەهارێ زوو دەری دەکا و ئـاخـری بـەهـارێ دەی وەرێنـێ وبـەری تـازە دەردەکاکە ئەویان دەبێ بەهەنجیر ودەخورێ.×

**باگا** : بەخەبەر، بەئاگا، نەنووستوو.

**باڵ** : تەنیشت ، کەلەکە: ( *گوللە باڵەوباڵ سمیویە* ).+

**باڵەخانە** : خانووی لەیەک نهۆم زیاتر .

**باڵەفرتێ** : باڵەفرەی پەلەوەر لە سەرەمەرگ دا.

**بان** : بووایەن : ( *خۆزگە باش بان* ).

**بانە** : چوون بۆ جێگایەک یان بۆ کارێک بۆ ماوەیەکی کورت :( *بانەمەر ، بانەمازوو* ).

**بانەوبان** : چوون لە بانێکەوە بۆ بانێکی دیکە لەبەر کارنەکەری، مەرج نیە بازدانی تێدابێ.×

**باو** : روو، باوباوێنی منداڵ لەوەڕا هاتوە.

**باوەپیارە** : بابەگەورە، باپیر.+

**باوەڵۆو** : ١ـ بزنێک کەلە مەڕی خۆی هەڵ دەبڕێ و دەچێتە گەڵ مەڕی دیکە. ٢ـ بزنی بەلەسە.

**بای دارئاوس** : بایەکە ئاخری زستان دێ و داری پێ زیندوو دەبێتەوە.

**بای وادە** : بایەکی ئاخری زستان و هەوەڵی بەهارە:( *بای وادێ ، دەدا لە پەلکی کوڕادێ* ). « فۆلکلۆر »

**بای وەعدە** : بای وادە .

**بردن** : ئازاردان، ئەنگاوتن :( *سەرما بردوویەتی* ).

**برژەبرژ** : برژانەوەی برین.

**برە** : ئەوبەشەی لێڕەوار کە بۆ یەکێک دانراوە بیکاتە گەڵ بۆ حەیوانات :( *ئێرە برەگەڵی حەمەیە* ).+

**برە** : وەختی گەڵ لێ کردنی جەنگەڵ کەبەسێ ساڵ جارێک دەبێ : ( *برەی هاتۆتەوەواتە وەختی گەڵ لێ کردنی هاتوە* ).+

**برق** : قرپ : ( *برقم دێتەوە ، واتە قرپم دێتەوە* ).

**بڕگە** : جمگە، گە: ( *هەموو بڕگەقامکەکانم دێشن* ).

بروێت : دارێک دووساڵ لەمەوبەر کرابێ بە گەڵ.

بڕمک : جێگای بەردانەوەی ئاو لە جۆگەی ئەسڵی یەوە.+

بڕێم : دارێکە کە پار کرابێ بە گەڵ.

برینگ بڕ : وەختی بڕینەوەی مەڕ و بزن : ( *ئەم شوانەمان برینگ بڕێ شەرتی دەپەڕێ* ).

بڕینەوە : پێک گەیشتن لە سەودا و مامەڵەدا : ( *جووتی بە هەزار تمەن بڕیمانەوە* ).+

بڕینەوە : قسە یەکدیگیر بوون : ( *قسەی خۆم لەگەڵ بڕیەوە* ).+

بزماریەگا : وەختی پرکاری :( *لەو بزماریەگایەدا* سێ ڕۆژە نەچۆتە مەزرایە ).

بزووت : جمی، جوولا .

بزێ : ئەو نێنگوونە کە دەبوو بزێ و نەزاوە.بە جوانەگای سێ ساڵەش هەر دەڵێن بزێ.

بژاربڕ : بژارچن.

بلاڵووک : بەلاڵووک ، بەری دارێکی کێوی یە لە ئاڵوباڵو زۆر وردترە.×

بڵغەبڵغ : غڵدە غڵد، قسەی « نافصیح » .

بناوبوێر : نەخۆشی نێوبەنێو.+

بناورە : داروچیلکەی ورد و وشک بۆ ئاور کردنەوە.

بن بار : بەشی بنەوەی بارەدار : ( *دژی سەربار* ).+

بن بەردەقی : ئەو ڕێواسەی لە بن بەرد هاتۆتەدەر، کە سپی و شیرن و شلکە.

بن پەرگە : بن چینی کلاشی کوردی.

**بن جۆخین** : بن خەرمان.

**بن چێخوون** : بن جۆخین.

**بندار** : ئەو گیایەی رەگەی زۆر بە زەوی دا چووبێتە خوار.

**بندار** : ئەو گیایانە کە سەلکیان هەیە وەک پیواز و سیر و ... .

**بن دانەوە** : بن هەڵکۆڵین . کێلآنی بن داری میوە.

**بن دڕاو** : کچێک کە کچێنی یەکەی هەڵگیرابێ.

**بن دڕاو** : جەواڵ، تەلیس یان هەمبانەیەک کە بنی کون بووبێ.

**بن دڕین** : دانەوە و هەڵکۆڵینی بنی بەرد بۆ ئەوەی ئاسان هەڵ کەندرێ.

**بن دڕین** : کچێنی بردن.

**بندۆک** : ئەو مووە ناخالیسە کە لەوەختی بەشەکردنی خوری و مەرەز وموودا دەکەوێتە بنی شەیەکە.+

**بن دەوەن** : بریتی یە لەو شتە کە دەدزرێ ونایەتە حیساب.

**بنک** : بنەدار :( *نووبنکم قەیسی چەقاندوە* ).+

**بنەبڕ** : تەواوبوون لە بارکردن دا :( *نووبارم ماوە بنەبڕ نم ، مالی خالم بنەبڕ بوون* ).+

**بنەتا** : نیوەتا :( *باراشەکەم نوو بنەتایە،لە کەرێی دەنیم و لەسەریەوە سوار دەسم* ).

**بنەتۆو** : کچ بە شوودان بەومەرجە ئەگەر کچی بوو خوێنەکەی بۆ مالی بابی بێ :( *کچەکەی بە بنەتۆو داوەتێ* ).+

بنەوشە : جۆرە قەزوانێکی زۆر ناسکە.+

بنەوشە : مازوویەکە کە تازە دیاریی داوە.+

بنەوەند : توولە دارێکی لێرەوارە، گەرمی دەکەن و بای دەدەن و دەی کەنە رستەی جووت کە نیر و ئاموور پێکەوە دەبەستێتەوە.

بنێشتەخۆشە : وردی زمان.ئەوەی کە دەکەوێتە سەر زارورزمانان

بوورە : زەویی قەت نەکێلراو ، ئەوەی ساڵێک یان چەند ساڵ نەکێڵرابێ، بەیارە.×

بوورەدێر : ئاوداشتنی زەوی بە مەبەستی نەرم بوونەوە بۆ کێلان.

بۆرەقانی : چێشتی کوولەکە بە دۆکەشکە.+

بۆنەورروو : بۆنی سووتانی خوری و موو.

بۆزەل : بۆنی باتلاغ.

بووژان : هەڵ نەدان ، دژی بووژانەوەیە.×

بۆڵوو : بۆڵە تریێ، گلە تریێ.

بووم : هەمبوو :( ئەسپت نیە ؟ بووم . فرۆشتم ).+

بەتاڵ کردن : خاڵی کردن.+

بە توێڵک : بە توێکل.

بەخاوکەوتن : لەش ئێشان بەکار یان بەرێ رۆیشتن دوای ماوەیەک دانیشتن ( بۆ ئەسپ و ولاغیش دەگوترێ ).

بەخۆراگەیشتن : خەریکی خۆ بوون و خواردنی باش خواردن و خۆ پاک و خاوێن راگرتن.

بەدیارەوەبوون به دەرەوە بوون، دیار بوون :( *هەموو لەشت* بە

دیارەوەیە ).+

**بەدیارەوەدانیشتن:** ئاگا لیٚ بوون و وریایی لیٚ کردن.

**بەدیارەوەدانیشتن:** راوەستانی کچ لە سەر برای کە بە ژنی بدا یا لە سەر کوڕێک کە بیخوازیٚ.

**بەر باردوو** : ئەوحەیوانەی کە وەختی زانی بووە و نەزاوە ، وەک بزن وەمەڕی دووساڵە ونینگوونی سیٚ ساڵە

**بەر بواردوو** : بەرباردوو.

**بەربەلەت بوون** : بەرد بەلەت بوون، کاری حەستەم :( *هەتا رازیم کرد بەر بەلەت بوو* ).

**بەرچۆڵەمە** : بەرخەبەبە ، بەرچەنەگە ( غبغب ).

**بەرچۆڵەمە** : چەرمی داچۆڕاوی ملی رەشە ولاٛغ.

**بەردان** : بەر هیٚنان ( *بۆ دار* ).+

**بەردان** : با دەرکردن : ( *تڕ بەردان* ).+

**بەردبەلەت بوون:** بەر بەلەت بوون.

**بەردە تراوک** : بەردەتراویلکە.

**بەردە ترۆق** : بەردە تراوک، بەردیٚک کە هەتاو لیٚی دا و لە دوور ڕا دەدرەوشیٚتەوە.

**بەرکار** : ئەو کرەی بەبەرکاری جۆلاٛ یان تەون کەرەوەیە.

**بەرکار** : شوێنی کاری جۆلاٛو تەون کەر :( دەچمە *بەرکاریٚ* ).

**بەرکردن** : قوڕ یان خۆڵەمیٚش لە بەری سیٚلٚ هەڵسوون بۆ ئەوەی کاتیٚک نانی پیٚ دەکەن نانەکە نەگریٚ.

**بەرکردن** : نویٚ کردنەوەی لیٚفەی کۆن بەوە کە بەریٚکی تازەی لیٚ دەدەن.

**بەرکوت** : بەرکوڵ، خواردنێکی کەم پێش جەمی نیوەڕۆ یان شێو .+

**بەرکۆژە** : دووبەن لە هەردوو لابەرۆکی چۆغە یان کراس دەنران بۆ داخستنی بەرۆک :( *بەرکۆژەی بۆ لێنێ* ).

**بەرکەڵ** : نێنگونی دووساڵە تەواو کردوو. بۆ جوانەگاش دەگوترێ کە ماناکەی دووساڵەیە.

**بەرگایی** : نێوبژی، بەرپیوانی.+

**بەرگران** : حەیوانی لەسەر زان.

**بەرگورد** : بەشی خوارەوەی گوردی جۆلایی، بە بەشی سەرەوەشی دەگوترێ سەرگورد.×

**بەرمەڵۆ** : شتی گەلاڵە کراو :( کچێکم بەرمە*ڵۆ* کردوە، واتە خۆی و کەس وکارم دواندوە بی هێنم ).

**بەرنانەوە** : نێوکۆڵ و گڵ وێ هەڵدانی تەماتە و بێستان و...

**بەرنیر** : ئەو کایەی لە بەر نیری دایە و خاوەنی جووتی پێ دەکا :( *پایزانێ بمرێ گای بەرنیری* ). «فۆلکلۆر»

**بەرنیو** : جوانەگایەک کەوەختی جووت پێ کردنی هاتبێ.

**بەرودوا** : ئەوەڵ و ئاخر :( *ئەوەی بۆم باس کردی بەرودوای مەسەلەکە بوو* ).+

**بەرووله** : ئەو دارە باریکەیە کە لە شیلەپەرادەکرێ تا نەهێلێ باسکێشەکە داکەوێ.×

**بەرمچۆ** : چەند ریزە دێراوە توتن و بێستان کە لە جۆگەیەکەوە ئاو دەدرێن.

بەرمجووت : بەروبوومی جووتێک گا لە کشت وکاڵ دا (خەسووبەرمجووتن). « فۆلکلۆر »

بەرموپیل : پێشواز. رەنگە ئەوە راست تر بێ لە بەرەوبیر. چونکە بە پێشوازی میوانەوە دەچن و پیل واتە قۆڵی دەگرن.

بەز : سواربوو، لێهاتوو:( *نێرمکەری ماین بەز* ، واتە ئەو نێرمکەرەی کەماینی لێ چاک دەکەن ).+

بەزمان زانین : شارەزایی لە خوو رەوشتی کەسێک و توانای حاڵی کردن.

بەزمان زانین : لێ زانین :( *سەعاتەکەم کارناکا* ، بۆم تەماشا کە *داخوا بە زمانی دەزانی ؟* ) .

بەزمک : جۆرە کوانێکە لە دەست و لاق دێ.+

بەزێن : تێپەرکەر، لەبەرچاو نەگر :( *نیوان بەزین* ).+

بەساڵ دا چوو: بەساڵاچوو، وەنیوکەوتوو.

بەساڵ داچوون: بەساڵاچوون، وەنیو کەوتن.

بەسان : ناوێکی ژنانەیە.

بەسەراچوون : لەناکاو گەینە سەر کەسێک کە کارێکی ناشیرین دەکا.+

بەسەرادان : بەسەردادان، هێرشی لەناکاو.+

بەسەرکردنەوە : سەردانی گەورە لە چووکە.

بەسەرکردنەوە : سەرحیساب بوون، ئەژماردنی ماڵات بۆ دڵنیا بوون لە مانی هەمووان.

بەشقم : بەشکوو، بەڵکوو.

بەشکۆ : خاوەن شکۆ، بەعەزەمەت.

**بەشکۆ** : شەرمێون :( زۆربەشکۆیە ، هەتا پێی نەڵێ دەست بۆ ئاوی خواردنەوەش نابا ).

**بەفربەسەر** : چیای بەفر بەسەرەوەماو.+

**بەفرماڵ** : ئەو ئامرازەی بەفروباران لە شووشەی ترومبێل دەسڕێتەوە.+

**بەفرەبەسەر** : بەفر بەسە ، ئەو بەفرەی سەرەکەی بۆتە سەهۆڵ و بنیادەم بەسەری دا بڕوا تێ ناکەوێ.

**بەقر** : دەفری مسی برش هەڵێناو،مسی سپی نەکراوە.

**بەقووندا کەوتن** : کەسادی بازار، نەفرۆشرانی کاڵا.

**بەکل** : کلاوی، چاوی کل تێ کراو :( چاو بە کلە ، شل و ملە ) « فۆلکلۆر » .

**بەکەریەبردن** : خەڵەتاندن، ( فریودان )، بەفریوبردن.

**بەکەین و بەین** : ئەهلی تەون و بەست.

**بەگا** : زەوی یەک کەپاش داشتنی وەختی کێلاّنی هاتۆتەوە، جابۆ هەر مەبەستێک بکێڵرێ.×

**بەگۆشت** : حەیوانێک کە زۆری گۆشت هەیە. بۆ کاتی سەربڕین و قەسابی دەگوترێ.

**بەگۆشت** : زەوی یەک کە خاکی نەرمی زۆرە و لە کێڵاّنی ـ دا کاسن ناگاتە سەر بەرد و رەقەن.

**بەگون** : پیاوی بە زیپک و زاکوون.+

**بەلاّ لێ دراو** : تووشی موسیبەت هاتوو.

**بەلەز** : بەپەلە :( بەلەز و هەڵپە هەموو زۆر بەدەون ، هێندی پێشرەون و بڕێ لوا ئەکەون ) «هەژار».

**بەلەسە** : بزنی «سەر» ، بزنێک کە زەحمەت دەگیرێ.+

**بەلەشین** : بزنی گوێ لوولی رەنگ شین.

**بەند** : رەگ :( *رۆڵە رووناکی گلێنەی چاوم ، بەندی جەرگ و دڵ مێزی هەناوم* ).+ « هەژار »

**بەن دەمبێن** : ئەو بەنەی دەمبێنی گا و گۆلی پێ دەبەستن.

**بەندەن** : برگەی ئاو لە کاتی ئاوداشتن دا :( سێ بەندەنم *داوەتێ* واتە لە سێ برگەوە ئاوم تێ کردوە ).+

**بەنک** : لزگە، لیزگە ئەندازەیەک مووروویی پێکەوە هۆنراو :( بەنکە زەنگیانە، بەنکە دەسحێب ).+

**بەی** : بەڵێ، با .+

**بەیت و باو** : دەنگۆ داخستن، ناوزڕاندن :( *بەیت و باوی بۆ هەڵبەست* ) .

**بێ ئازار** : ئەوەی ئازاری بۆ کەس نیە.

**بێ ئەسڵ و نەسەب** : ناکەس بەچە، نانەجیب.

**بێتان** : هێلانە سمۆرە، ئەو جێ یە کە سمۆرە جووچکەی تێدا هەڵ دێنێ.

**بێتەڵماڵ** : ماڵ بەکۆڵ :( *هەردەڕۆم و دەنالم ، وەک دەروێش بێتەڵماڵم* ). « فۆلکلۆر »

**بیرازتن** : رەهەند لێ دان بۆ دەرکردنی تەڕایی لە نێو خانوودا تا خانووەکە نەڕزێتەوە.+

**بێرەمەڕ** : کاتی مەڕ دۆشین، کاتی بیرەدۆش.

**بێ سەروزمان** : فەقیرحاڵ، بێ دەنگ و بەحەیا و ئەدەب.+

**بێ شێ** : بووزوویەک کە لەوەختی رایەڵ کردنی دا شۆ ،

واتە سرێشی کەم لێ درابێ، دژی ڕەقەشێ.+

**بێ شەرت** : بێ مەیل، بێ وەفا ( لە دڵداری دا ).

**بیێڵێن** : بی یەڵێن، ئەوشوێنەی « بی » ی خۆڕسکی زۆرە.

**بێ مزەرەت** : بێ وەی، بێ ئاسیو.

**بێ واز** : بێ تاقەت.

**بێوک** : ناوکێکی ڕەقە لە نێو بەڕوو دا، بێوکە.

**بێوکە** : بێوک، جانەوەرێکە لە کەشکی کۆن پەیدا دەبێ.

**بێ ویژدان** : بێ ئینساف.

# پیتی پ

**پاراو** : ئاوداشتنی کێڵگەیەک کە کرابێتە دێراو.+

**پارووبژێر** : پارووژمێر، نان نەخۆر، رژد .

**پارووژمێر** : پارووبژێر.

**پازدان** : بازدان.

**پازگە** : بازگە، بەردەباز، پردەباز.

**پاشبار** : لای پاشـــەوەی بـاری ولاغ :( *پاشباری بۆ هەڵێنە با بارەکەی راست کا* ).

**پاشبار** : دواباری کۆچ و کۆچبار، دژی پێشبار.

**پاشبارە** : ئـەو دارەی ئـامــرازی جــووت کــردن کــە دەســگــرەکــەی تــێ بـڕاوە. دەســگــرەکــە دەستەمستەی پێ دەڵێن.×

**پاش پانی** : قووڵایی هەردووڵای ئێسکی پاژنە ( *پاش پانی پڕ بەو ژنە دەڵێن کەئەم لا و ئەولای پاژنەی پڕبێ و قووڵایی تێدا نەبێ* ).

**پاشخان** : جێگای دانیشتنی نۆکەر و بۆرەپیاوەکان لە ماڵە ئاغایان دا . جێی شتوومەک و چخانە.×

پاشدار : دارێکە لە تەون و جۆلایی دا لە پشتەوەی گورد لە نێو رایەڵەکە رادەکرێ.

پاشدان : پاشان، دوایە ، لەپاشان.

پاش دان : پاش نیوەڕۆی کارکردن.

پاشقول دان : بن دەوەن کردن، نەهێنانە حیساب، شاردنەوە بە نیازی دزین.

پاکۆ : گیا دروون بێ ئەوەی گەوزی باوێژرێتی و بکرێتە دەسکەسواڵە.

پاکۆدان : بەداس دروونی بێ گەوز.×

پاڵیت : ئەو پەڕۆ کۆنانە کە خڕ دەکرێنەوە و کەلێن و کونیان پێ دەگرن.

پاڵیت : ئەو پەڕۆ و پاڵەیە کە لە پاشەوەی خەڵیفە مێش رادەکرێ.

پاڵێن : بردنەوەی مەڕ بۆ لەوەڕ پاش دۆشینی ئێواران هەتا وەختی ماڵ نووستنان.×

پان و پلیچ : پان بووەوە لە ژێر پێ دا.

پانی : ئەو جێگایەی کە بنیادەم راست لەسەری رادەوەستێ، بەشی دواوەی لاق، دژی پەنجە.

پاوانە : ئەو زیوەرەیە کە دەکرێتە بێی ژنان ( زێڕ بێ یان مووروو ).×

پاووپووز : بەلەک :( *لەپردی سوور بەولاوە ، پاووپووزی هەڵ داوە* ). « فۆلکلۆر »

پایزە : مەقامێکی کۆنی کوردی یە.+

پایزەبرا : دۆستێکە کەهەر لەکاتی فەرعانە وحاسڵات دا

بێته لات.×

**پایزی** : جۆرێک هەرمێ یە.+

**پر** : نەکاو :( لەپڕ واته لەنەکاو ).+

**پڕژوپاڵ** : خشت و خاڵ.

**پڕوپانێر** : پڕوپاتاڵ، گاوگۆل.

**پڕوپیرێژن** : ژنانی پیر، ژنانی خۆبەحەکیم زان.

**پسکێر** : پیسکێر، پیس ، پیس لەوەڕ.

**پشته** : مەودای هەموو کارگەی جۆلایی لە بووزووی نەتەنراو.+

**پشتەماسی** : جۆرێک درووماندە، عادەتەن تەختە جاجم و بەرماڵی پێ لێک دەدروون.+

**پشک** : ئەندامێکە وەک سمێڵ لە لەشی هێندی جانەوەردا : ( دووپشک ).+

**پشک** : ئاوێکی سپی یە کاتی هەوەس بزووتن بە جێگای شەرمی ژن دا دێتە خوار.+

**پشووبڕ** : هەناسە سوار:( پشووبڕ بووم ).

**پلتۆخ** : پیس و پەلۆ، ناخاوێن .

**پلۆغان** : دوای وشەی « دا » داپلۆغان، بە مانای دامرکانە .

**پنج وەلۆر** : مۆرووپنج، دەست لێ نەدراو.

**پۆپرە کەڵەباب** : کلاوەی کەڵەباب.

**پۆرگ** : جێ یەکی کەم لە زەوی دا کە لە باقیی زەوی یەکە بەتاقەت تر یان کەم تاقەت تر بێ.+

**پۆز** : فیز، دەمار :( زۆر بە پۆزە ).

پۆسک	قوون.+

پۆسکە	گلۆینەی تەندوور.

پۆسکە	ئەو کونەی خەڵیف کە مێشەنگوینەکان هاتوچۆی پێدا دەکەن.

پۆش	بزنێکە کە گوێی پنۆک پنۆک رەش وسپی تێکەڵ بێ.×

پووش بەسەرە	بێ دەنگە لێ کردن، دیزەبەدەرخۆنە.

پووشپەڕ	هەوەڵ مانگی هاوین.×

پووشکە	زلەگیای وشک :( *پووشکە لە کایە نابژێردرێ*).

«فۆلکلۆر» بۆ دار بەکار نابرێ.×

پووشکەبەقوونە	جانەوەرێکی باڵداری کلک درێژە.

پۆلانیا	سەر کردنەوەی گاسن و تەور و ... کە ئاسنی تازەی دەخەنە سەر .دەمەزەرد نیە.×

پۆل بەدەرزی	گەمەیەکە پۆلێک بە دەرزی یەکەوە دەکەن و بە بەنێک هەڵی داوەسن و هەرکەس لە راست خۆیەوە فووی تێ دەکا، ئەوەی توندی فووڵێ نەکا دەم ولەوسی دەسووتێ.

پەرتووک	پلکەنان : ( *پەرتووکێ نانیمان لە ماڵێ دانیە دەبێ هەویری بشێلم* ).

پەرداخ	تەنک :( *دەمی داسەکەم بۆ پەرداخ کە* ).+

پەرک	پەرکە ، چیلکە و چاڵی ورد و باریک کە پاش دارەڕا دەی هاوێنە خانوو.

پەرگە	ئەو کەلافە بەنانەیە کە بۆ کلاش چنین دەیان هۆننەوە.

**پەرگە** : گل، یان پەینێک کە بەهاران بە بەفری سەر زەرعاتی وەردەکەن بۆ ئەوەی زوو بتوێتەوە.
**پەرگە هاویشتن** : گلْ و پەین پێداکردنی سەر زەوی وزرار.
**پەڕەهاڵویشتن** : رۆیشتن بۆ هەندەران بۆ ژیان و کاسبی.
**پەستوان** : پەستیوران، پێ پەست بوون.
**پەستواو** : پەستێوراو.
**پەلاپیتکە** : پەلەپیتکە، ئەو ئامرازەی چەک کە بۆ تەقاندن دەستی پێدا دێنن.
**پەلبڕ** : پەلە داری بە تەوراس بڕاو.
**پەڵوو** : چێشتێکە ئارد و ئاو تێکەڵ دەکەن و دەی کوڵێنن و رۆنی لێ دەکەن.
**پەڵۆ** : پەڵۆخ، پلتۆخ.
**پەلەپیتکە** : پەلاپیتکە.
**پەلەسوانە** : سەرەچیلکەی سەرە سوانەی خانوو.
**پەڵەک رەش** : خالْ و بەڵەکی بەهاران لە کوێستان.
**بەنداو** : پەنگاو ، ئاوی راوەستاو.
**پەیاغ** : تێلا، داردەست.
**پیاو** : بریتی یە لە گان کردوو: ( *لە بووکێ بۆتە پیاو* ، واتە بۆتە زاوا ، کچێنی یەکەی لابردووە ).+
**پیاوەتی** : توانای گان کردن :( *لە پیاوەتی کەوتوە* ، واتە گانی پێ ناکرێ ).+
**پیاهەڵکاڵین** : پێ هەڵکاڵین، بەچاوەوە کردن.+
**پێپڕکە** : چینە کردنی مریشک.
**پێ پەست** : پێ خۆست، پێ شێل :( *وارشی گالادرێ و*

دەربەست بێ ، بەس لە *داگیرکەری پەست پێ* پەست بێ ). «هەژار»

**پێپلارە** : جۆرێک پیکە لە توێکڵی توولە بی سازدەکرێ و فووی پێدا دەکەن.

**پێتاو** : پینەی کاڵە، کوتە چەرمێک کە دەخرایە جێی کون بووی کاڵە و جا کاڵەکە لە پێ دەکرا : ( *کاڵە و پێتاو* ).×

**پێتەک** : بێچووی رەشەولاغ :( *ئەم مانگایە پێتەکی جوان* دەبینێ ).+

**پێتەک** : گژمباوگەردەلوولێکی کورت خایەن لەزستان دا .+

**پێچووکە** : پیچکە، هەندرێشە ، جۆرە گیایەکی کوێستانە.+

**پێ چەقاندن** : پێ داکرتن لەسەر مەبەست، سووربوون.

**پێ چەقاندن** : مانگرتن لە رۆیشتن.

**پێچەڵپووچ** : ئاڵۆز، سەرلێ دەرنەکراو.

**پێدافسین** : سواربوونی کەڵەباب لە مریشک.

**پیڕاندن** : دەنگی پڕمەی نێری یە کێوی.+

**پیرۆز** : ناوە بۆ ژنان.+

**پیڕۆکە** : منداڵی تازە پێ گرتوو.

**پیڕە** : دەنگی پیراندنی نێری یە کێوی.+

**پیسکێر** : پیس و پەڵۆ، پسکێر.

**پێ سووک** : پی و قەدەم خێر، ئەوەی کاری ژن خواستن و مەسلەتی باش بەدەستەوە دێ.

**پێشبەند** : بەروانکەیکارکردن.+

**پێش دان** : دانی پێش نیوەڕۆ بۆ کارکردن.

**پێکران** : ئەنگوان، ئەنگێوران.+

**پێکۆ** : دروێنەی گیا بەبێ دەسکە سواڵە گرتن و هەر بە دروون و خڕ کردنەوە.

**پێکەوەنان** : وەسەریەک نانی ماڵ و سامان.+

**پیلەوار** : باسکەملە، دارێکی گەورەی سووتاندن کە بە شان لە دارستان ڕا دەی هێننەوە و لە ماڵێ وردی دەکەن.

**پێ مەلە** : مەلە پێ یە :( *بڕوانە وشکە سۆفی و ڕەقسی بە هەلهەلە ، دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێ مەلە* ). « نالی »

**پێ وەدان** : پێ و دانی ئاش :( *لەم پێ و دانە باراشەکەم بۆ لێ کە* ).+

**پێوەچوون** : دیاری بردن بۆ ماڵان بە بۆنەی بووک هێنان و منداڵ بوون و ... .×

**پێوەچوون** : پەرەگرتن ، « سرایت ».+

**پێوەنان** : لێ زیاد کردن، « مبالغە ».+

# پیتی ت

**تابیلا** : دووپات کردنەوەی داوا و تکا :( *دووجارم لێ تابیلا کردەوە بەقسەی نەکردم* ).

**تاتوو** : هێندێک گەڵ، یان گیای پێکەوە نووساوی وشک: ( *تاتووە گەڵێک بۆ ئەو بزنە دانێ* ).

**تاربوون** : داگەڕانی بەغار بە سەرەوژێردا.

**تاژڵلۆرە** : تاوێر، جاڵە، بەردێک کە لە بەرزایی خلۆر دەکرێتەوە.

**تاسکەتاسک** : ڕۆیشتن بە ناز و غەمزە :( *بە لەنجە و تاسکەتاسک ، رادەبرن وێنەی تاسک* ).«هێمن»

**تاڵەگەزە** : گیایەکە گەڵای چەور و تاڵە ، لەگەڵ دانەوێڵە کەوێ تاڵی دەکا.

**تاڵیتۆز** : گیایەکە گەڵای وەک گەڵا تووێ دەچێ، بەڵام ناخورێ.

**تام وخوێ کردن**: ڕۆن و خوێ لە چێشت کردن.

**تام وخوی کردن**: کەمێک لە چێشتی سەرئاگر خواردن، بۆ ئەوەی بزانرێ ڕۆن وخوێی تەواوە یان نا.

تانه : تەیمان، دیواری بەچەپەر.

تاودان : تەنگەتاو بوون، گووهاتن :( *واتەمێ دەکرێ لە فێرگەی شۆرش ، تاوی دا و بچێتەوە گۆڕی کۆرش* ). « هەژار »

تاوتۆ : هاوتاکردنی دوو لینگەبار ئەگەر یەکیان قورستر بوو.×

تاوتوو کردن : بریتی یە لە بە دەست گرتنی ژن.

تاوەباران : ڕێژنە بارانەی کەم دەوام.

تاوەسووت : میوە یان گیایەک ئەوەندە لەبەر هەتاو مابێتەوە سووتابێ.

تاوەسووت : ڕەنگی پێستی لەشی کەسێک کە زۆر لەبەر گەرما کاری کردوە.

ترشەکە : ترشۆکە، گیایەکی مزرە.

ترنجان : تێک ئاڵقانە، نەک چوونە نێو.×

ترۆق ترۆقە : تۆق تۆقە، بەری گیایەکە وەک کەلووە نۆک ، منداڵ دەی تەقێنن.

ترۆق ترۆقە : تەپاڵەی نیوە داگیرساوە، منداڵ هێندی تف لە سەر بەردێک ڕۆ دەکەن ، تەپاڵە داگیرساوەکەی لە سەر دادەنێن و بە کوتک لێی دەدەن ، تەقەی دێ.

ترۆق ترۆقە : بۆمبایەکی دەنگی یە منداڵان لە باڕووت دروستی دەکەن.

ترونج : ئاوێکی گشتی یە بۆ ئاسنەواڵی شت بڕ وەک داس و تەوراس و چەقۆ.

**ترمقه** : چەشنی بۆ تەقاندنی فیشەک و ساچمەزەن و بۆمبا و نارنجۆک و ... .+

**تسەگورگە** : فسەگورگە، کارگەفسە، جۆرە کارگێکی ژەهراوی یە.

**تفەنگچی** : ئەنگێوە، دەست راست.+

**تلوورکردن** : قوون تلوور کردن، سەر دەعەرزی نان و قوون دەهەوا کردن.

**تلۆفک** : گلۆ فک، لکی هەرەسەرەوەی دار.

**توانا** : هێز، ئیمکان :( *لە توانام دا نیە* ).+

**تۆراغ** : شویت.+

**تورنە** : باڵندەیەکی کێوی یە.

**تۆزاش** : تۆزی ئاشی.تۆزی ئاش کە لە لەشی ئاشەوان و خەڵکی دیکە دەنیشێ.

**تۆق** : بەشێک لە زەوی :( *ئەم تۆقەی رەقە ، ئەو تۆقەی گەنمی چاکی هێناوە* ).

**تولانەوە** : لەبەریەک بلاو بوون لە بە زۆر گەیشتن .(بۆمیوە)

**تولانەوە** : بە نەخۆشی دەست وپێ سارد بوونەوە : ( *بەجارێک خۆی تولاندۆتەوە* )، بۆ بێ غیرەت دەگوترێ.

**تۆل دان** : زگدانی دیوار، ئەوە کە بەشێکی دیواری تازە دەردەپەڕێ و نیشانەی رووخانیەتی.

**تۆمارکردن** : وەرگرتنی دەنگ بە قەوان یان شریت.+

**تۆمارگە** : جێگەی تۆمارکردنی دەنگ ورەنگ لەسەرشریت.

**تۆن** : تەن، هەزار کیلۆ.

توندمتەبيات : ئەوەی زوو توورە دەبێ.

توومەرەنگی : گیایەکە گەڵاکەی وەک گەڵای ماش دەچێ و بەرەکەی لە تووەگایە دەکا.

تووە قەسپە : جۆرێک تووی سپی یە دەنکەکانی گەورەن و شیرنە.

تووەمۆرە : جۆرێک تووی شیرنی ئامال رەشە.

تونشە : نانە بستە، بیسکویت.+

تەبەق : نەخۆشی یەکە لە سم و زاری مەڕ و بزن و مەنگا و گامێش دەکەوێ .بەکەمی ولاغە بەرزەش دەیگرێ.×

تەبەک : تەبەق.×

تەپ تەپی : کەسێک کە تەنیا تەپڵە سەری کەچەڵە .

تەپڵ دڕاو : بێ ئیعتیبار، ئەوەی ریسوا بووە، ئەوەی کەس باوەڕی پێ ناکا.

تەپلە : بەشێک لەکڵاو کە تەنیاسەری بنیادەم دەگرێ.+

تەپڵەک : جۆرێک گوێنیی ریوەڵەیە، لە جێی گەرمێن زیاتر دەڕوێ، بەهاران دەیدەنە ماڵات.

تەپڵەک : قەندان.+

تەپڵەگوێنی : تەپڵەک :( هێندەم کردوە مەشکەژێنێ ، سەرم بۆتە تەپڵەگوێنی ). « فۆلکلۆر »

تەپلی باز : توێ یەکی ناسکە لە نێو زگی حەیوان دا، منداڵ تەپڵی لێ درووست دەکەن.

تەپەللەغ : دارێکە لەکارگەی جۆلایی دا لە پشت سەری جۆلا هەڵکەوتوە ، رایەڵی بووزووی بەسەردا

دەڕوا.

**تەخار** : تەغار، ٣٠ دانە ( تەغارێک گەنم ٣٠ ڕبەیە ، تەغارێک تەپاڵە ٣٠ دانەیە ).

**تەخت بوون** : بە لەباری دانیشتن.+

**تەخت بوون** : ڕاست ڕاکشان.+

**تەختەبەند** : داپۆشینی خانوو بە تەختە لە سەر دارەڕاوە .

**تەختەبەند** : دیواری بەتەختەدار دروست کراو.

**تەختەپەین** : بۆ زەوی بەکار دەبرێ کە پەینی زۆر لێ درابێ.

**تەختەپەین** : بریتی یە لەو جێگایە کە پیاوی تەمبەڵ و زگ لەوەڕێن باشی لێ دەگوزەرێنێ.

**تەختە لێ کردن**: مانەوەی زۆر لە جێ یەک :( دە شەوان *تەختەم لێ کرد* ).

**تەرک کەوتن** : نەخۆشی یەکی گوێ درێژە ، شەل دەبێ بێ ئەوەی لاقی شکابێ. بە کینایە بۆ پیاو بەکاردەبرێ.

**تەرک کەوتن** : گان پێ نەکرانی گۆلەکەر لە ئاکامی جۆرێک نەخۆشی دا .بەکینایە بۆ پیاویش بەکار دەبرێ.

**تەرکەتوڵڵا** : بەهیچ جۆر :(*تەرکەتوڵڵا خزمایەتیت ناکەم* ).

**تەرکەوڵات** : ئاوارە، دەربەدەر، لە وڵات دەرچوو.

**تەرمەکەمە** : بێگانە، نامۆ، غەوارە.

**تەس** : دەنگ دانی ئاژەڵ بۆ ئەوەی پاشەوپاش بگەڕێتەوە.×

**تەقەڵ دڕانەوە** : دڕانەوەی بڕینی عەمەڵ کراو.

**تەقەڵ لەسەر**

یەک نەبوون : گێژی، پەریشانی :( مەی نوێنە ، تەقەڵی *لەسەر یەک نین* ).

تەلان : هەڵدێر، جێ یەک کە لاقی بە زەحمەت پێوە گیر دەبێ، دەتوانێ لە بناری نزیک دەشتیش بێ.×

تەلبەند : بە تەل پێکەوە نووساندنەوەی دەفری شکاوی چینی.

تەلدڕوو : سیمی دڕکاوی.

تەماوی : سەربەتەم، سەربەمژ.

تەمبوو : تۆپی ئاشی ئاوی.

تەمبێ : سزادان ، ئەدەب کردن.

تەمبێ یانە : ئەو پارەیە کە لەسەر کارێکی نابەجێ لە یەکێک دەستێندرێ.

تەمبێ یانە : ئەو کارەی وەک سزا بە کەسێک دەکرێ.

تەمتومان : تەم و مژ.

تەندوورە : کۆڵەکەیەک کە گێژەڵووکە لە تۆز و پووش و پەڵاش دروستی دەکا.

تەنک کردن : کوتانەوەی دەمی تورنج بۆ تەنک کردن.

تەنک کردن : هەڵکێشانی بەشێک لە شیناوەرد بۆ ئەوەی تەنک بێ و تاقەت بکا.

تەنکە کردن : هەستانی بەشێک لە دانیشتوانی مەجلیس.

تەنگ دان : پاڵ وێ دان ، پێگەیشتن :( تەنگی بە *بنارەوەدا* ).

تەو : جۆرێک کەوتنی جگی گەمەیە، دژی چەق.

**تەونكەر** : ئەوەی بەڕە و مافوور دروست دەكا، تەونگەر.

**تەون وبەست** : كەین وبەین، پیلان گێڕانی چەند كەس دژی یەكێک .

**تیاح** : وشەی سەرسووڕمانە :( تیاح كە درێژە ).

**تێ ئاڵقان** : گیر كردن.

**تێ چریكاندن** : بە دەنگی تیژ و بەرز گۆرانی گوتن.

**تێ چزان** : تێ زان، ئاو تێ گەڕان.

**تێچێن** : گەنمێكی كەم كە دەی بەنە ئاش بۆ ئەوەی پێش نۆرە بۆیان لێ كرێ ، تابێ نان نەبن.+

**تێ ڕاخوڕین** : بەدەنگی بەرز دەنگ دان و قسە لەگەڵ كردن.

**تیراوە** : كوانە ڕەشـە :( پیرمحمد تەڕە *تیراوەی دڵ* )
«هەژار»

**تێرنەخۆرە** : تێرنەخواردن لەبەر ئەوەی ماوەیەک نەخۆش بووە یان خواردنی دەست نەكەوتوە.

**تێرەخۆر** : ئەوكاتەی بەهار كە گیا بێ دەگا و ماڵات لێی تێر دەخوا.+

**تیرەشان** : شانەهەنگوینی درێژاودرێژ ، دژی گردەشان ، یان دەرخۆنە شان.×

**تیرەشان** : لاباسكی كێو، سەربەندەنی باریک و درێژ.+

**تیرەگ** : ئەستووندەک، دیرەک، كۆڵەكەی ڕاست و باریک.

**تیرێژوو** : پارچەیەكی درێژ و باریكە لە هەردوو تەنیشتی كراسی ژنان دا.

**تیرێژوو** : پارچە زەویی باریک و درێژ.

**تێشت** : چێشت، شێو، خواردنی بەئاگر كوڵێو.+

**تێشتان** : چێشتان، چێشتەنگاو.

**تێ شیشان** : بریتی یە لە چوونە بەرلینگی ژن بۆ بە دەست گرتن.+

**تێ قمین** : تێ قومین، تێ قومان، لە ئاودا نوقم بوون.

**تێ قوپین** : تێ قوپان، قوپان.

**تێک** : درز، قەڵەشت.

**تێک ئاڵقان** : تێک ترنجان، تێک گیران.

**تێک بادەڵدران**: لە یەک هالانی دووهەودا.

**تێک پەڕاندن** : راپەڕاندنی کار بە خێرایی.+

**تێک ترنجان** : تێک گیران، لێک گیربوون.

**تێک ڕابوون** : راپەڕین لە خەو.

**تێک ڕاچوون** : دەگژ یەک ڕاچوون.

**تێک ڕاخوڕین** : یەکتر دەنگ دانی لەنەکاو.

**تێک کردنەوە** : تێک خستنەوە :( *چاڵێکی هێندە قووڵە دوو گوریسان تێک کەیەوە ناگەنە بنی* ).+

**تێ کوتان** : نقورچک لێ دان بۆ وشیار کردنەوە، یان لە خەوهەستاندن.+

**تێ گرتن** : ئاو لێ نان :( *پیوازەکان تینوو ، شەوایان تێ گرە* ).+

**تێمان** : دامان ، سەرلێ شێوان :( *تێ ماوم ، نازانم چ بکەم* ).

**تێنگ** : بین :( *تینگم بە پلووسکێ وەنا هەتا تێرم لێ نەخواردەوە ، دەمم لێ نەردەوە* ).+

**تێوەدان** : گوێز لە گوێزدان لە گەمەی « واغێن » دا بۆ

ئەوەی جووتەکان لێک ببنەوە.

**تێ وەرین** : پێوەربوون بۆ خواردن و ... .

**تێ هەڵاتن** : چوونە نێو ئاو بە مەبەستی خۆ شوتن.

**تێ هەڵبوون** : بە توندی رووەو هەوراز چوون.

**تێ هەڵکردن** : پلار و بەرد لە داری بەرهەڵاویشتن :( پلارێکی تێ هەڵکە با هێندێک گوێز بخۆین ).+

**تێ هەڵکردن** : ملی هەوراز گرتن.+

**تێ هەڵێنان** : بەن لە تەلیس و جەواڵ راکردن بە بێ سووژن.

**تێ هەڵێنانەوە** : قەرەبوو کردنەوە.

# پیتی ج

**جاخ پێچکە** : ئەو دارە کە جۆلاّ کری تەنراوی لێ دەهاڵێنێ. ڕەنگە بناخەکەی جاوپێچک بووبێ.

**جارناجار** : جار نان جار، جاربەجار، بە هەڵکەوت.

**جامیلکە** : جامی چکۆلە.

**جاوڕایەڵ** : هاتوچۆی بێ جێ :( *ئەم جاوڕایەڵەت لێ چیە؟* ) جاورەیاڵ.

**جرپن** : جینگەنە، ترکەن.

**جڕوجانەوەر** : داعبای چووکەڵە چووکەڵە ( حشرات ).

**جرووکان** : سەرهێنانەدەری جووچکە لە هێلکە :( *هێشتا سەری لە هێلکە نەجرووکاوە لێمان بۆتە کوێخا* ).

**جڕیاوفڕیا** : ئازار و جەزرەبە.

**جزیاوفزیا** : جڕیا و فڕیا.

**جفجفە** : ڕوح تۆتیا.

**جفە** : جقە، چوکڵەیەکە لەپاش پەنجەی کەڵەبابی لە یەکسالّ گەورەتر دەردێ.

**جنجڕبەڵەک** : پنوک پنوک ڕەش و سپی تێکەڵ.

**جنگڵدان** : جینگڵدان، گینگڵدان، خۆ بزاوتن لە خەودا.

**جواب کردن** : دەرکردنی رەعیەت و نۆکەر و ... .+

**جواناو** : ئارەقەی ژنی ژان گرتوو.+

**جواناو** : ئارەقەی سەرەمەرگ :( *بای شەماڵ هات و ئەستێرێ وەک پەنجەی جوانێک جواناوی* ).

«هیمن»

**جووتە** : چوونی دوو فیشەک بۆ بەر لوولەی دەمانچە : ( *بەکەڵک نایە جووتەی دەکا* ).+

**جووتەی کەوی** : دوویراله، دوو ئەستێرەی لێک نزیکن.

**جووعە** : دەعبایەکی ئەفسانەیی زۆر ئاقڵە :( هێند زرینگە *جووعەی ناڵ دەکا* ).

**جووکە** : دەنگی باریکی با لێبوونەوە.+

**جۆلاتەنە** : جاڵجاڵووکە.+

**جەل** : چەل، جار:( *سێ جەل هاتم لە ماڵ نەبووی*).+

**جەم بوون** : ژەم کردن، تێر خواردن :( *ئەوە جەم بووین ، با بچینەوە سەرکارێ* ).+

**جەمک** : ماستێک کە دوو رۆژ لە هەوێن کردنی تێ پەڕیبێ، گۆیا رۆنی زیاتر دەکەوێتێ.+

**جەم مردوو** : جەم بردوو ، ئەوەی وەختێک برسیەتیی چاشتوە و ئێستا تێر نەخۆرەی گرتوە.

**جەوەر** : جەوهەر بە هەموو ماناکانی.

**جەوی** : شیلەی مەییوی بادام و قەیسی و ... .+

**جیفرک** : جووتە هەلاویشتنی ئێستر وبارگین و... .

**جێ گەورە** : نەجیب زادە، خانەدان.

# پیتی چ

**چاوۆکە** : پارچەیەک قوماشی سپی کە لە بن بووکیْ رادەخرا تا خوێنی کچێنی یەکەی بە سەردا برژیْ.+

**چاوبەرایی نەدان:** نەتوانین لە حالەتێک دا دیتن :( چاوم بەرایی *نادا ئەو قارەمانە بە زەلیلی ببینم* ).

**چاوپێداخشاندن:** بە پەلە چاو لیْ کردن، چاوپیاخشاندن.

**چاو پێدا**
**خشاندنەوە** : دووبارە چاو لیْ کردنەوە پێداچوونەوە.

**چاوپێداگێران** : لیْ ڕوانین بۆ هەڵبژاردن.

**چاوتێوەبڕین** : تەماح تیْ کردن، بەتەما بوون.

**چاوکراوە** : شاروبەرە گەڕاو، دنیا دیتوو، لە تەقە هەڵاتوو.

**چاوکسکە** : چاوکتکە،گیایەکە.

**چاونووسان** : گیرانی چاو بە ریپۆق لە کاتی چاوئێشەدا.+

**چاونووساندن** : چاوبەستن، فریودان، خەڵەتاندن.

**چاوەکسکە** : چاولیْ کردن بە ئیشتیاوە بیْ ئەوەی بەردەمی بکەویْ.

چرپه : دەنگی کەوتنی دڵۆپە.+

چڕوچیا : شاخ و داخ، کێوپارە.

چڕوچێو : داروبار، داری وشکی ورد.

چڕوکێو : چڕوچیا.

چریسکایی : زرنۆقی ڕۆن لەسەر شۆرباو.

چزە لێ

هەستاندن : پێوەدانی دووپشک و ... .

چڵخوس : ڕژد، نان نەدەر.

چلوو : مـاوەی بـێ نـوێژیـی ژن دوای مـنداڵ بـوون هەرچەند لە چل ڕۆژیش کەمتر بێ.+

چڵۆسک : بزووتی بە ئاگرەوە.

چل وەل : خۆبەسەرداسەپێن.

چڵە : چڵەگ، دیرەک، ئەستوندەک.+

چنگوڕک : چنگ، چنگـاڵ ، چنگی پشـیلـە و باڵندەی گۆشت خور.+

چنینەوە : خڕ کردنەوە :( بە شوانی یەی شەرم نیە ، بە نان چنینەوەی شەرمە ). « فۆلكلۆر »

چوارپاڵوو : دارێک یان بەردێک کە لەچوارلاوە تاشرابێ.+

چوارپینە : کەوشێک کە پێش دڕان پینە کرابێ.+

چوارمێزیلکە : چوارمەشقی، جۆرێک دانیشتنە.

چوارناڵی : لینگدانی بە پرتاوی ئەسپ.

چواڵە : چەقاڵەی تەڕ ( تاڵ یان شیرین ) .+

چوواو : قت کراولەیاریی پشکیلان وگۆرەوی بازی دا.

چۆڕاوکە : ئەوئاوەی لە سوانە و لیباسی شۆراو و ... دێتە

خـــوار :( چەتیو دەرکێم لێوەکە کوشتمی چۆڕاوکەی بانی ). « فۆلکلۆر »

**چۆڕاوگە** : پلووسکی بان، ئەو جێ یەی ئاوی سەربانی لێ هەڵ دەڕژێ.

**چووزەرە** : سەری دەرهاتووی کەنگر و گیای دیکە پێش پشکووتنی گەڵاکان.+

**چۆقین** : چۆقانی ڕۆن.+

**چۆڵەچرا** : بریتی یە لە ڕۆن گەرچک و نەوت.+

**چۆماو** : ئاوی چۆم، موقابیلی کانیاو.

**چۆماو** : ئاوی زۆر :( ئەم کانی یە چۆماوێکی پێدادێ ).

**چۆمی** : ئەو پەلەوەرانەی لە دەم روبـاران دەژین ، وەک سی و مراوی و ... .+

**چونک** : چونکە، چونکی ، لەبەرئەوەی.

**چونکین** : چونک.

**چونکینێ** : چونک.

**چونگین** چونک.

**چونگینێ** : چونک.

**چەپ و گووپ** : ڕاوڕووت، دزی و پاشقول دان.

**چەپەترووکە** : گیایەکە زۆر بەرز دەبێ، تۆوێکی وەک پەرش بەڵام گەورەتر لە پەرشی هەیە.

**چەپەخان** : زللە، شەپلاغە، زللە بە پشتە دەست.

**چەتەوڵ** : درێژی ناقۆلا.

**چەختی** : چوختی، لەگڵ دەرهاتوو، ڕاهاتوو.

**چەرمە** : گوێ قوت کردنی ئێستر و بارگین بۆ شەڕ و

هێرش.+

چەقڵەسەما : هەڵپەڕین لە خۆشی یان، وەسەما کەوتن.

چەق وتەف : گەرمەی کارێک یان ڕووداوێک.

چەقەسرۆ : قەرمچەناغ،ڕووهەڵماڵاو.

چەک وچۆڵ : چەک و چۆڵە، کەرەسە و ئامرازی شەڕ.

چەڵاک : دارێکی درێژ و باریکە، نووکی لێ دەنێن بۆ مازوو لە دار کردنەوە.+

چەڵاوک : چەڵاک.

چەماو : چۆماو، ئاوی چۆم.+

چەمۆڵە لەسەر دادان : ئەوەیە کە تاژی نێچیرەکەی دەخاتە بن چنگی و ڕای دەگرێ، تا ڕاوچی دێ لێی وەردەگرێ.

چەمۆڵە لەسەر دادان : سەگ و تاژی نان و ئێسک وەبن چنگیان دەدەن و دەی خۆن .

چەمەرچۆپی : بەلا و موسیبەت، بەسەرهاتی ناخۆش، تەنگانە.

چەوت وچەوێل : چەوت و چێل، خێچ و خوار.

چەورە : گیایەکە لە تیرەی بۆڕ و کەما و لۆ.+

چێ : فێر :( سە بە سەمەرگی یان چێ یە ).+ «مەسەلی کوردی»

چیخ : چیغ.+

چێرەگرتوو : سامەڕستوو، ئەوەی سامی لە کاری خراپ شکاوە.

**چێشتانە** : ئـەوەی سـەربــاری حـەقـدەســـت وەک دەس خۆشانە دەدرێ بە وەستای سنعەتکار .+

**چێشتەقوڵە** : ئەو چێشتە کە کەبانووی نەوسن هەربۆ خۆي یان بۆ خۆی و مێردەکەی لێ دەنێ.+

**چیلانگەر** : ئاسنگەرێک کە وردە حەواج دروست دەکا .+

**چێنکە** : پاشماوەی ڕایەڵی بەڕە کە دەی بەن و دەی کەنە بەندروو.+

**چێو** : داروباری وشک، چڕوچێو.

**چیوچیوە** : دارێکی دووپەلە لە هەردووسەری باگردانی بەرد ڕادەکرێ و پێی دەگێڕن.

**چیوچیوە** : دوو ئاڵقە دار یان ئاسن کە دەخرێنە دەسکی باگردانی دارەوە بۆ گێڕانی.

**چێوەسان** : جۆرێک بڕبەندە لایەکی تەختە و لایەکەی دیکەی کووڕ ( محدب ) ە ، داری پێ دەڕنن.

# پیتی ح

حاسیلکە : تێ کوشینی ڕۆن و دۆشاو.

حاوانەوە : جێ بوونەوە:( *خانوومکە چووکە، چاکە تێی دا حاوانەوە* ).+

حشکاوس : ئیشکاوس، کچێک کە بە ڕێ خستن ئاوس بووبێ.+

حوب : لە ناخی دڵەوە: ( *بە حوبی دڵ حەزدمکەم وابێ*).+

حوباندن : خۆش ویستن: ( دەی حوبینم ).

حوکم : جۆرێک یاری بە پەڕی قومارە.+

حەبەسان : تاسان، واق وڕمان.

حەبەساو : تاساو، واق وڕماو.

حەپۆمێش خۆر: بریتی یە لە ئینسانی گێل و نەزان.

حەپامێش خۆر: حەپۆ مێش خۆ .

حەزنەوەر : حەشاماتی زۆر: ( *ئەو هەموو حەزنەوەرە کۆبڕا کۆبوونەوە؟* ).

حەسابی : قسەی بە ڕێ و جێ.

**حەسابی** : پیاوی ماقووڵ.

**حەسپنگ** : ئەسپنگ، ئەسپینگ، شنگ.

**حەستەمەکەڵی** : سواربوونی جوانەگا لە مانگایەک کە بەکەڵ نەبێ.

**حەستەمەکەڵی** : زۆری لێ کردن.

**حەشروحەلەلا** : زەنا زەنا، هەڵاوهەنگامە.

**حەشیا** : ئەشیا، هیچ شتێک: ( *حەشیای خوای لەم ماڵەدا نەمێشت* ).

**حەواتیلکە** : بەردهەڵدان بۆ حەوا بە دەست یان بە قۆچەقانی ، بە بەردەکەش دەگوترێ .

**حەوترینگە** : چێشتێکە زۆر دانەوێڵەی جۆراوجۆری تێ دەکرێ .

**حەوترینگێنە** : حەوترینگە.

**حەوجێ** : پێویستی، « احتیاج »: ( حەوجێم پێت نیە ).

**حەول ودەول** : هەوڵ و تەقەلا.

**حەولەوەلا** : تەنگانە: ( *خستیە حەولەوەلاوە* ).

**حەیتە** : زۆڵ، بیژوو، منداڵی حەرام زادە.

**حەیشان** : حاوانەوە، وێ هەڵکردن: ( *لەگەڵی ناحەیشێ* ).

**حیزفرسەت** : ئەوەی بەناپیاوی دەرفەت لەیەکێک دێنێ و کارێکی لەگەڵ دەکا.

**حیزوسلامەت** : ئەوەی هەموو شتێک قبوول دەکا بۆ ئەوەی تووشی مەترسیی گیانی نەبێ.

**حیسابی** : حەسابی، قسەی بەڕێ وجێ، پیاوی ماقووڵ.

**حیلاندن** : حیلەکردنی ئەسپ.

# پیتی خ

خام حەلاو : قوماشێک بوو لە لۆکە: ( *بەرهەڵبێنەی خام حەلاوە ، هەردەرۆی و دەکراوە* ). « فۆلکلۆر »

خامە : توێ شیر، سەرشیر، قەیماغ.+

خامە : کورت کراوەی خانم بۆ خۆشەویستی.+

خانبڕ : چەکێک کە خانەکانی نێو لوولەکەی خوڕابن، سوابن یان خۆرکە لێی دابن.

خانزاد : بێچووە خان.

خانزاد : ناوە بۆ ژنان.

خانم وخاتوون : بریتی یە لە ژنی بە ناز و نووز.

خانی خانان : سەرداری سەرداران: ( *یان دەتکەمە خانی خانان ، یان دەتکەمە تۆزی بانان* ).«فۆلکلۆر»

خانی لەپ زێڕین: قارەمانی چیرۆکی کوردیی « قەڵای دمدم ».

خاوک : ڕیسێکە بۆ تێوەدانی بەڕە دەڕێسرێ و زۆر گشتی ناکەن.×

خاوکردنەوە : ئارام کردنەوە.+

خاوکردنەوە : بریتی یە لە نیشاندنەوەی شەرمی پیاو.+

**خایەن** : پاشگر بە مانای پێچوون :( *درێژخایەن* ).

**خرتک** : جمگەی دەست و لاق: ( *لە خرتک چووە واتە جمگەی ترازاوە* ).

**خرتەگەل** : جەڵەبی خرت و نێری.

**خڕکردنەوە** : کردنە تۆپ، کردنە کەلا .+

**خرمانلۆغە** : خەرمانلۆغە، گەنم یان جۆیەک کە لەسەر خەرمان دەدرێ بە هەژاران.

**خڕمچوون** : خڕومچوون، هەموو، گشت.+

**خڕنە** : کوودەڵە، بێچووی بەراز.

**خڕوپڕ** : قەڵەو و تورت و تۆل.

**خرۆشان** : راپەڕین، هەڵەشکوتن، ئاڵۆز بوون.

**خڕیلانە** : ژنی خڕکەڵەی جوان.+

**خڕیلە** : خڕیلانە.

**خزە** : دەنگی بڕین بە تیغی زۆر تیژ.

**خزە** : دەنگی هەناسەی کەسێک کە سەرمای بووبێ و گەرووی بیەشێ.

**خزە** : دەنگی رۆیشتنی شتی وردبەنێو گەڵای وشک دا

**خفتان** : تۆوێکە کە پایزێ درەنگ دەچێندرێ بۆ ئەوەی بەهارێ بڕوێ.×

**خواداد** : خواداو.

**خواداو** : ئەوەی خوا داویە.

**خوار** : خۆراک: ( *شێوەخوار* ، واتە خۆراکی شەو بۆ ماڵات ) .+

**خوارەبا** : باپەنا، جێ یەک کە با نەی گرێتەوە: ( خۆ

دەخـوارەبایان دەگـرێ ، واتـە خـۆ لـە کـار دەدزێتەوە).+

خوان : پنە، ئەو شتەی ئەنگوتکە هەویری لەسەر پان دەکرێتەوە.+

خواوڕاستان : باش بوو خوا ڕەحمی کرد.

خۆبەرزارخستن : کردنی کارێک کە لۆمە و لەقەمی خەڵک بەدوای خۆی دا بێنێ.

خۆبەستنەوە : بریتی یە لە خۆ مقید کردن بە کارێکەوە یان بە شتێکەوە.

خۆیان کردنەوە: پاڵدانەوە ، خۆ لەکار بواردن.

خۆتێ ڕاکردن : بە زەحمەت چوون بۆ جێگایەک کە خەڵکی زۆر لێ یە و جێی بەتاڵی نەماوە.

خۆتێ هاویشتن: بازدانە نێو ئاو، خۆ هاویشتنە نێو ئاو.

خۆتێ هاویشتن: خۆ دەنێو حەشیمەت ڕاکردن.

خۆڕازاندنەوە : خـۆجـوان کـردن، جـل وبـەرگـی جـوان لـەبـەر کردن.

خۆڕاژاندن : بزواندنـی لـەش لـە کـاتـی ئێش یان خـەم و خەفەتی گەورەدا.

خۆڕاک : ئەوەندە باڕووتە کە جارێک ساچمەزەنی پێ داگیرێتەوە.+

خۆڕاک : ئەوەندە دەرمانی ڕەوانی کە بەشی عیلاجی نەخۆشێکی قەبز بکا.+

خۆڕانان : فڕوفیشاڵ کردن، سنگ دەرپەڕاندن.

خۆڕاوی : خۆڕایی.

**خورج** : گورج، باری ولاغ که زۆر لەسەر پشتی بێ ، دژی شۆڕ.

**خورد** : چڕ و پڕ: ( دەوەنێکی خوردە ).+

**خوردکردنەوە** : گۆڕینەوەی پارەی درشت بە وردە.

**خوردکردنەوە** : چاوخوردکردنەوە، جوان سەرنج دان، بیر لێ کردنەوە.

**خۆرشت** : چێشتێکی سووک کە لەگەڵ پلاو دەخورێ.×

**خۆرشت** : تام: ( *خۆرشتی خۆشە* ).

**خورشید** : ناوە بۆ ژنان.

**خۆرکە** : مۆرانە بۆ دار و کتێب و جل و بەرگ.

**خوری شور** : لێدانی زۆر ، لێدانی توند: ( *کەری کوتا خوری شور، لەخوێن سووربوو ملی بۆر*). « هەژار »

**خوری یە جندە**: قەوزەی سەرئاوان.

**خووز** : بۆ دار بەکار دەبرێ، ساڕێژ بوونەوەی جێ برین : ( *خووزی هێناوەتەوە* ).

**خۆزگەخواستن** : ئاوات خواستن.

**خۆش**

**خەت وخال** : ئەوەی بە ڕواڵەت جوانە و ئاکاری خراپە.

**خوول** : ئەستوور، قەڵەو : ( *خەجە خوول* ).+

**خۆڵماڵ** : گەسکدەری شەقام و کۆڵان، سەپوور.+

**خۆڵەپۆتینە** : ڕەنگ خۆڵەمێشی.

**خۆلێدان** : قەرە لە قەرەدان: ( *دەوێری خۆی لێ دەی ؟*).

**خۆ مت کردن** : چوونە کەمین ، کەمین گرتن.

**خوێ کردن** : خوێ لێ دانی چەرم و شت بۆ ئەوەی بۆن

نەکا.

خوێن پژان : خوێن لە لووت هاتن.

خوێن ڕاسان : خوێن پژان.

خوێن ڕێژی : خوێن لێهاتنی برین، سەرخوێن کەوتنی ژن لە غەیری وەختی خۆی دا.

خەپاڵ : خەپەتۆڵە ، قەڵەویچکەی جوان.

خەجڵان : سەرلێ شێوان، پەشۆکان.

خراپ پێ کردن: پەند بەسەر هێنان : ( *ئەو کارەی بکەی خراپت پێ دەکەم* ).

خەراج : باج و پیتاک.

خەرت : نێری و بەرانی دووساڵە و بەرەوژوور.×

خەرتەلە : گیایەکی بەرزە باڵایە لە نێو دەغڵ و دان دەڕوێ.+

خەرمان لۆغە : خەرمان لۆخە ، گەنم یان جۆیەک کە لە سەر خەرمان دەدرێ بە هەژاران.+

خەڕەک : دەزگایەکە جۆلاً تێوەدانی پێ لە سەر « لولو » هەڵ دەکا.+

خەڕەکەشکاو : بریتی یە لە هەر دەزگایەکی شڕ و شپڕێو ، تەنانەت بە بنیادەمی شل و ولیش دەگوترێ.

خەزرین : غەزرین ، ڕق هەستانی زاڵم لە مەزلووم.+

خەزەڵ : گەڵای گوێز ئەوکاتەی تازە شین بووە.+

خەزێم شۆڕ : خەزێم بەزرێزە ، بریتی یە لە ژنی جوان و بەناز و نیمناز.

خەشخاشک : خاشخاشک، خاشخاش، خەشخاش.×

**خەفتان** : خفتان.

**خەفەبوون** : خنكان، پشوو لێ بڕان.

**خەفەبوون** : كز بوونی شوقی چرا، داكشرانی پلیتەچرا.

**خەڵقندە** : ئافەریدە، دروست كراو: ( *بەو خوایەی هەمووماني خەڵقندە كردوە* ).

**خەڵوە** : چپە، قسەی بەسپایی: ( *ئەو سرتە و خەڵوەتان لە چیە ؟* ) .

**خەم خواردن** : مشوور خواردن، بۆ هەڕەشە بە كار دەبرێ: ( *ڕاوەستە خەمت دەخۆم* ).

**خەم خواردن** : خەفەت خواردن.

**خەمشە** : كونی پاشەوە: ( *لەپاش تڕێ خەمشەی دڕێ* ). « مەسەلی كوردی »

**خەنەتیلكە** : ئەو شینكەیەی لەسەر بەرد دەڕوێ و زوو وشك دەبێ، « گلسنگ »

**خەوخەوی** : ئەو كەسەی هەمیشە خەوی دێ.

**خێزمرە** : پۆلە دەوەنی كورتەبالا و چڕ وپڕ.+

**خێزمرە** : خڕبوونەوەی ماسی لەقەڵشتە بەردی نێو ئاودا.+

**خێزمرە** : لەسەریەك كەڵەكە بوونی كوللە ئەو كاتەی دەیەوێ لە چۆم و ئاوان بپەڕێتەوە.+

**خێشك** : ئەوەی لە چەپەردروست دەكرێ وكڵۆشی دەغڵ و دانی پێ دەكێشنەوە سەرخەرمان.

**خێگە** : هێزە ، پێستی خۆش كراو بۆ هەڵگرتنی دۆشاو یان ڕۆن.

# پیتی د

**دائێخستن** : قفڵ کردن،گاڵە دان: ( *دەرگاکە دائێخە* ).+
**داب تێکدان** : لەبەرچاو نەگرتنی داب و شوێن.
**داب داهێنان** : کردنەباو ، داهێنانی ڕێ و شوێن : ( *ئەم دابە تازەیە ئەتۆ دات هێنا* ).
**دابەستن** : دەمەقاڵێ کردن : ( *لەگەڵی دامەبەستە* ).+
**داپاچین** : بڕینی لک و پۆپ لە سەرڕا بۆ خوارێ.×
**داپرۆغان** : داپڵۆغان، سووتانی زۆر سەخت.
**داپرووزان** : پرووزان بە گڕی ئاگر.
**داپەچنین** : پەستاوتن، تێ پەستاوتن.+
**داتولاو** : میوەی زیاد لە ئەندازە گەیشتوو.+
**داچۆڕان** : داهاتنی لکەدار لە بەر بەری زۆر.+
**داخی بەجەرگم** : داخی گرانم.
**دادروون** : بریتی یە لە ئامۆژگاری کردن بۆ نەدرکاندنی نهێنی.+
**دادوڕۆ** : دادوهاواور،دادوفغان.
**داریۆکردن** : بریتی یە لە پێشکەوتنەوە:( *لە بێشەرمی دا*

*داری بۆ هەموو بیشەرمێک کردوە )*.+

**داربەڕۆحداادان** : زەبر لێدان.

**داربەڕۆحداادان** : قسەی هەق و قەپرغەگیر پێ گوتن.

**دارحەمبالْ** : دارێک کە لە سەر دیواری بەرهەیوان درێژ دەکرێ و بنی کۆڵەکەی دەخرێتە سەر.

**داڕزان** : بڕیتی یە لە شەرمەزاری : ( *دەبوود/بڕزێی بەڵام ئەو کارە نەکەی* ).+

**داڕژان** : داباڕین، داوەڕینە سەر : ( *داڕژانە سەری* ).+

**دارقەزوان** : دارەبەن، دارینێشت.

**دارقەڵنە** : کلکی داری قەڵنە.

**دارقۆنگرە** : ئەو دارەی قونگرەی ئەستێراوی پێ دەبەستن و دەکەنەوە.

**داروبەش کردن**: دابەش کردن، بە شینەوە.

**داڕووشان** : رووشانی لەش لە کاتی کەوتن و بەربوونەوەدا : ( *لایەکی پشتم داڕووشاوە* ).

**دارەڕووت** : ئەوکاتەی گەڵای دار دەوەرێ و مازووکردن ئاسان دەبێ.

**دارەزەرد** : ئەوکاتەی گەڵای دار زەرد دەبێ و مازوو بە زەحمەت دەبینرێتەوە، چونکە هەم ئەو و هەم گەڵاکە زەردن.

**دارەهەرزاڵ** : ئەو دار و کۆڵەکەیە کە هەرزاڵی پێ دروست دەکرێ.

**دارەهەرزاڵ** : ئەو دارەیە کە لە نێو لکەکانی دا هەرزال دروست دەکەن و میوەی تێدا هەڵدەگرن بۆ

زستان.

**دارهەنە** : دار تەون، دەزگای تەونکەران.

**دارپۆتن** : هەڵوەراندنی گڵی کەنداڵ یان هەر شتێکی بە ئاسانی لێ بێتەوە.

**داس وەشێن** : پاڵە، پاڵەی ئازا، دروێنەوان: ( *حەمە داس ـ وەشێنە ، گاڵتە نیە* ).

**داشتی** : داشت، حەیوانی راگیراو بۆ زاوزێ.

**داقنان** : زۆر کز بوون لە ئاکامی نەخۆشی، یان بێ خزمەتی دا.

**داقناو** : زۆر کز بوو لە ئاکامی نەخۆشی، یان بێ خزمەتی دا.

**داقەڵاشتن** : راکردنی خێرا سەربەرەژێر.+

**داکردن** : هەڵنانی بەرد وهێلکە و... بۆ نیشانە تفەنگ.+

**داکردن** : بڕینی لک و پۆپی دار لە سەرێ ڕا بۆ خوارێ.

**داکوتان** : مانەوەی زۆر لە جێ یەک: ( *دە ڕۆژان لە بۆکانێ دام کوتا* ) .+

**داکەفتک** : داکەوتوو ، بەربووەوە لە بان، لەبار، لە داری میوە و هەربەرزایی یەک.+

**داگرتن** : ئاخنینەوە: ( *دوو بارە کام داگرتوون* ).+

**داگرتن** : ئارام کردنەوە: ( *بە چوار کەسان لە بەری دا شل و کول بوون بۆیان دانەگیرا* ).+

**داگرتن** : ساز کردن: ( *شەوێ باران دادەگرین و بەیانی زوو لێ دەنێین* ).+

**داگیراندن** : داگیرساندن لە گۆرەوی و شتی چنین.+

**داگیرساندن** : داگیراندن.+

**داماڵان** : لە سەرەوە بۆ خوارێ داخزان: ( پێستی سەرم *داماڵا* ).×

**داماڵین** : لە سەرەوە بۆ خوارێ داخزاندن: ( تۆزێکم پشتێ *داماڵە* ).×

**دانارە** : گیایەکە وەک وێنجە و سێوەرە، بۆ ئالفی ئاژەڵ زۆر بەکەڵکە.

**دانان** : گریمانەکردن: ( *وام دانا ئەتۆ نەهاتی ، ئەمن* بە تەنێ چ بکەم ؟ ).+

**داناو** : دوائاو کە دەدرێ بە زرعات بۆ ئەوەی دانەکەی قەڵەو بێ.×

**داندۆکە** : خواردنێکە لە شیرێژ و سوورازە.

**دان شاش** : دان لێک دوور، بۆ شانە و شەنە و شتی وا بەکار دەبرێ، هەروا بۆ ددانی ئینسانیش.

**دان شاڵ** : دان شاش.

**دانەڕێژە** : ئەوەیە کە دەنکە گەنمی باراش دەڕژێنە نێو ئاردەکە.

**داووناو** : بەتایبەتی، بەدانستە: ( بە *داووناو هاتوومە سەردانی ، کەچی دەڵێ چۆن بوو هاتی* ! ).

**داوەت** : بانگهێشتن بۆ نان خواردن.+

**داوەران** : تێ ورووکان، لە دەور کۆبوونەوە.+

**داوەرین** : لە دەور کۆبوونەوە.+

**داوەستان** : راوەستانی ئاوی مەند لە گۆم یان لە دێراو و

قوڵکه و ... دا.

داوەڵۆزی : نزیک بوونەوەی مریشکی هێلکەکەر لە هێلانەکەی و سەر ڕاوکەکەی .

داوەڵۆزی : بریتی یە لە دەورەدانی جێگایەک بۆ مەبەستێک: ( *داوەڵۆزی لە دەوری ماڵی ئەو کچە دەکا* ).

داهێنان : زیادکردنی برنج لە کاتی لێنان دا: ( برنجی چاکە زۆر *دادێنێ* ).+

داهێنان : پرسینەوە : ( *مەتەڵۆکەیەکم لێ داهێنا* ).+

داهێنان : چەماندنەوە : ( *گۆچانێکم داهێنا* ).+

داهێنان : دەورەدان : ( *لەو بێوەژنەی داهێناوە جابزانین چ بە چ دەکا ؟* ).+

ددان هەڵبوون : ددان ئاڵ بوونەوە بە شتی ترش.

دڕ : قەڵشت، مەودا : ( *دڕی بە ڕیزی دوژمن دا و خۆی لە گەمارۆ دەرباز کرد* ).+

دڕدووک : تووتڕک ، میوەیەکی خۆرسکە.

درزدان : قەڵشین : ( *دیوارەکە درزی داوە* ).

دڕوو : تووتڕک، دڕدووک.

دڕووەڵان : دڕکاوی، دڕاوی، ئەو جێ یە کە چقڵی زۆرە.

دژخەو : کەم خەو، ئەوەی درەنگ خەوی لێ دەکەوێ و زوو زوو خەبەری دەبێتەوە.

دڵ برژان : دڵسۆزی : ( *دڵم بۆت دەبرژێ کە خەڵک بە خراپە باست دەکا، بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم* ).

دڵ بزوێن : دڵگر، هەست بزوێن.

دڵ بەجەخار : دڵ بە ناسۆر.
دڵ بەداخ : دڵ بە جەخار.
دڵ بەزووخاو : دڵ بە جەخار، دڵ بە ناسۆر.
دڵ بەسۆ : دڵ بە ناسۆر، خەفەتبار.
دڵ بەغەم : خەمبار، خۆشەویست مردوو.
دڵ بەناسۆر : دڵ بە زووخاو.
دڵ پەڕینەسەر : ئاشق بوون ، خۆش ویستنی دەسبەجێ : ( *هەرکە چاوم پێی کەوت دڵم پەڕیە سەری* ).
دڵ گرتن : بەردڵ کەوتن : ( *دڵم نای گرێ* ).
دڵ گەرم : دڵ نارەحەت، ناڕازی، دڵ ڕەنجاو : ( *بە دڵگەرمی قسان دەکا* ).+
دڵگیران : خواردن پێ نەخوران.+
دڵۆ : کەلێن، کون : ( *دڵۆی تێدا نیە* ).+
دڵەو : دڵۆ، کەلێن : ( *دڵەوی تێ کەوتوە*).
دەم پان کردنەوە : قسە نەزانین : ( *هەر دەم پان دەکاتەوە ، بۆ خۆشی نازانی دەڵی چی* ).
دەم پژان : لووت پژان، خوێن ڕاسان.
دەم پیس : زمان پیس، جنێوفرۆش.
دەم دادان : دەم لە زەوی دانی ئاژەڵ بۆ لەوەڕ : ( *ئەم مەڕە نەخۆشە ، ئەمڕۆ دەمی دانەداوە* ).
دەم شڕ : دەم پیس، جنێو فرۆش.
دەمەزەرد : دەمەزەرد، بریتی یە لە تیژکردنەوە و ئاودانەوەی ترونج، نەک سەرکردنەوە.×

دنک : دەنک، دانە.

دوازدەسوارەی

مەریوان : دوازدە شەرکەری کوردی نێو چیرۆکە حەماسی یەکانن.

دوازدەمانگ : بە درێژایی ساڵ : ( *دوازدەمانگە چ خۆم چ منداڵم، بۆی دەچەوسێمەوە و ژیان تاڵم )* «هەژار»

دووبان : ئەوەیە بەشێکی بانی خانوو بلندتر لە بەشەکەی دیکە بێ.

دۆبڕ : فرۆشتنی هەموو بزن و مەڕەکان بەسەر یەکەوە.

دۆخاو : چیمەنتۆی خالیسی بە ئاوگیراوە کە بۆ ساف و لووس کردن بەکار دەبرێ.+

دۆخە : ئەو حەیوانەیە کە بە کرێ یان بە پیاوەتی دەدرێ بە کەسێک هاوینێ رزقەکەی بخوا و پاییزێ بیداتەوە.×

دوورئەنگێو : ئەو چەکەی دوور دەڕوا ، دوورهاوێژ.

دوورئەنگێو : تفەنگچی یەک کە لە دوورەوە نیشانە دەپێکێ.

دوورەتفەنگ : تفەنگ هاویشتن لە دوورەوە :( *بۆ دوورەتفەنگ لە برنو چاکترم نەدیوە* ).

دوورەشەڕ : شەڕنەویست، لاشەڕ.

دۆرەمبێن : زارەمبێن، ئەو بەنەی زاری مەشکە و هەمبانەی پێ دەبەستن.

دووقوزودووقوون: بریتی یە لە پیاوی دووڕوو.

**دووگونه** : گیایەکە وەک زیزانە، بەرەکەی جووتیلەیە، وەک گونی بنیادەم هەڵکەوتوە .×

**دوولک** : دارێکی دووپەلە ، وەختی گەڵ کردن لە مەڵۆ گەلی دەدەن و حەوای دەدەن بۆ ئەو کەسەی قۆری یە گەڵەکە دادەنیّ.

**دوولکەدار** : پڕی دوولکێک داری سووتاندن :( *دارمان نەمابوو دوولکە دارێکم هێنایەوە* ).

**دۆم** : وەستای کلاش دروست کردن.

**دۆمەڕەشکە** : قەرەج ، قەرەچی.

**دوونە** : قەیرانی زستان ، قڕانی ماڵات لە زستان دا ، ساردوسەرمای سەختی زستان.

**دووێڵ** : دۆڵ، دۆلاش، ئەو دارە ئەستوورە کە دەکۆڵرێ و ئاوی ئاشی پێدا دێتە خوار.

**دووێڵ** : ئەو دارە کۆڵراوەیە کە باراشی وەسەر دەکرێ.

**دەباراندابوون**: لە تواناداب‌وون ، لەدەست هاتن :( *هیچی دەباران دا نیە* ).

**دەبەڕاهاویشتن**: بە پارێز داوای شتێک کردن :( *دووسێ جارم بۆ کچەکەی دەبەر راهاویشتوە* ).

**دەبەرکەوتن** : بەساڵداچوون ، کزبوون لەبەر پیری :( *زۆر دەبەر کەوتوە* ).

**دەبەرگەڕان** : بەفریا کەوتن ، بوون بە سەدەقە :( *داخوا نانی چ فەقیرێکی دەبەر گەڕاوە نەجاتی بووە ؟* ).+

**دەبەرمراندن** : بە قوربان کردن :( *دەبەرمخۆت دەمرێنم* ) ژن دەیڵێن.

دەبەرنیشتن : مل دانە کاریکی قورس.
دەبەرنیشتن : چوونە بەرلینگی ژن بۆ کاری ژن و پیاوەتی.
دەجا : دەی جا :( *دەجا بەتۆچی ؟* ).
دەخۆنووسان : غاردان، بەغار ڕاکردن.
دەراوڕوونی : تێ ڕادیتن :( *لە ماڵی بابی هیچ دەراوی ڕوونی نیە ، ناوێرێ بچێتەوە* ).
دەرچوو : لە ئەزموون دا سەرکەوتوو.+
دەرخۆنەشان : شانە هەنگوینی خڕ. ( مدوّر )، دژی تیرەشان.
دەردوداخ : خەم و جەخار.
دەردەمانگە : فێڵە مانگە ، لەمەیی ، نەخۆشی یەکە منداڵ دەیگری. تووشی ئیسحال دەبێ.
دەرکاودەرک : سووڕانەوەی بێ جێ :( *ئەم دەرکاودەکەت لێ چیە ، بۆ لە ماڵی خۆت دانانیشی ؟* ).
دەرگانە : شیپانە ، بەردەرگا ، « آستانە » .
دەرماڵ : پارچە زەویی چووک و زبڵ لێ دراو کە بکرێ بە شیناوەرد.+
دەروژوورکردن : هاتوچۆی دەری ماڵێ بۆ کاری میوانداری و شتی وا.+
دەرەدزە : خۆدزینەوە، بە دزی یەوە خۆ لەکار بواردن.
دەرێ کردن : وەرێ خستن :( *بەم بارانەیە ئەم کورەت بۆ دەرێ یە کرد ؟* ).
دەزگر : دەستگر ، وردەکارێک کە زۆر وەختی سنعەتکار بگرێ .

دەزگرۆیی : پوول بە قەرز دان ، چاکە لەگەڵ کردن.
دەزوولە : هەودا دەزووی باریک.+
دەژاروژمنگ نان وێ هەڵنەکردن :(*لێی دەژاروژمنگ نـا ، هـەتا وەدەری نەناوازی لێ نەهێنا* ).
دەس بەسەردا
هێنان : لاواندنەوە ، ئاگالێبوون.
دەس پێشخەری: پێش دەست بوون ، دەست وەپێش خستن.
دەستاو : ئەوەندە ئاوە کە کاری ئاوداشتنی پـــــــێ بکرێ :( *کانی یەکە تەقیوە و دەستاوێکی ئاو پێدادێ* ).×
دەست پێشخەری دەس پێشخەری.
دەست کوژ : حـەیوانێکە هـەربۆ گـۆشت سـەربـڕابێ ، نەک لەبەر نەخۆشی یان گورگ لێدان.+
دەست کەلا : ئەوەی دەبێتە داردەستی یەکێک.+
دەست گران : ئەو کەسە دەستکوژی زوو دەمرێ.×
دەست مێژ : مـێژۆک دان ، فرچک دان ، بێچووی ساوا لە گوانی دایک هەڵخستن.
دەست لە کراس
دەرهێنان : ورە بەردان ، ناهومید بوون.
دەست وەست
کردن : دەست دەنێو دەستی یەک نان ، دەستی یەکتر ماچ کردن.
دەستەبارە : بەشەدار بۆ هەڵکردنی ئاوروچکەی منداڵان.
دەستەپاراو : ئەوەندە ئاوە کە پاراوی توتنی پێ بکرێ.

**دەستەچیلە** : ئەو دارە باریکانە کە لە ئاوری ماڵە دراوسێ دادەگیرسێنرێن بۆ ئەوەی لە ماڵێ ئاوریان پێ بکرێتەوە.×

**دەستەک** : چەند داری کورت و باریکن ، لە چەند جێگاوە لە کاریتە دەبەسترێن و لە هەر لایەک کسێک شانیان بەردەدا.×

**دەستەوار** : میقدارێک نان بێ ژماردن :( *دەستەوارێکم نان لە پێش دانا هەمووی خوارد* ).+

**دەستی دەستی**: دەستاودەست پێ کردن ، حەواڵە بە گەواڵــە: ( *دەستی دەستیم پێ مەکە* ).

**دەس حیسێب** : ئەو پارە نەغدەی بە قەرز دەدرێ بێجگە لە شتوومەک.

**دەسخۆر** : قبوولی ، برینج کە نەپاڵێورێ و نەکرێتە پلاو : ( *بە دەسخۆرم لێ ناوە* ).+

**دەسرازە** : ئەو شریتە وئەو پەڕۆیانەی منداڵیان لە لانکە دا پێ دادەبەسترێ.

**دەسڕۆیشتن** : دەوڵەمەندی.+

**دەسڕۆیشتوو** : دەوڵەمەند.

**دەسەشکاو** : پەک کەوتە ، دەستەشکاو.

**دەکوو** : دەک ، هەی ، یاخوا :( *دەکوو ماڵت خەرابێ بۆ کارێ کردت* ).+

**دەڵق** : نـایـلـۆنـی روون بـۆ پـەنجــەرە :( *شووشەی پەنجەرەکەمان شکا ، دەڵقم لێ داوە* ).

**دەم چەقەڵ** : چەقـەڵ دەم ، کـەسێک دەم و شـەویلاکـەی

رەقەڵە و ناشیرین بێ .

**دەم دادان** : لەوەڕانی ئاژەڵ :( ئەم بزنە نەخۆشە دەم *دانادا* ).

**دەم دەما** : بەرەبەرە، دەمەو :( دەم *دەمای بەیانی* خەبەرم بۆوە ).×

**دەم سارد** : دژی دەم گەرم ، تاژی یەک کە لە نێچیر گرتن چالاک نیە.

**دەمکانە** : دەمکانە لە دارمازوو، داربەڕوو، دارقەیسی و ... دەردێ نەک هەر لە دار مازوو.×

**دەم لەپووش** : دم لە پووش ، ئەوەی لە بەش کردن دا هیچی پێ نابرێ.

**دەم لەدەم نان** : لەگەڵ کەوتنە شەڕ و چەقە :( دەم *لە* دەمی مەنێ ).

**دەم لە کالان نەکەوتن** : لێ نەبڕینەوە ، قسەکردنی بێ وچان :( سێ *سەعاتە دەمی لە کالان نەکەوتوە* ).

**دەم و ددان** : دەم و دیان ، زار و ددان .

**دەوەناش** : کێشەی نەفامانە ، دەوەنە ئاش . دەوەناشی گرژاڵی یان بەناوبانگە کە داستانی خۆی هەیە.

**دەمۆڵ**

**دەنگ نەدان** : قسە نەڕۆیشتن :( *کاکە ئەمن دەمۆڵم دەنگ نادا* ) .

**دیاردی** : ئەو کەروێشکەی لەسەر لان دەبینرێتەوە.

**دێد** : خوشکی مێردی ژن. خوشکی گەورە « داد » ە

نەک «دێد ».×

**دیدارناخرەت** : ئـــەوەی دەمـــــری و ئـــاواتـــی دیـــتــــنـــەوەی خۆشەویستێک دەباتە بن گڵ.

**دێمانە** : یەکەم شت کە سەر هەڵ دەدا ، یەکەم چڵی بێستان و گژوگیا کە سەردەردێنێ :( *دێمانەی داوە ، دێمانەی هاتوە* ).

**دیمبڵی میمبڵی** : بریتی یە لە تەپڵ ودەهۆڵ و زوڕنا و ئەوشتانە.

**دێمکار** : زەویی دێم ، دژی بەراو ، پشتاو.

**دێمکار** : ئەو شتەی بە دێم دادەچێندرێ :( *بێستانم بە دێمکار کردوە* ).

**دێمەرە** : چۆلەکە دێمەرە ، پاساری .

**دێمەکار** : دێمکار.

**دیواودەر** : بریتی ئەم دیو ئەو دیو :( *گوڵلەکە دیوار و دەر بووە* ) .+

**دیواودیو** : ئەم دیو ئەو دیوی چیا :( *دیواودیوم پشکنی چڵە ڕێواسێکم لێ نەدی* ) .+

# پیتی ر

رابووریـن : رابووردن، نەک رابواردن.×

رابەستن : ئاو هەڵبەستن لە جۆگەڕا بۆ سەر شیناوەرد.+

رابەستن : پێچانی برین.+

رابەستن : پێچانی ئەندامێک لە بەر ئێش یان بـــە درۆ : ( *قامکی خۆی رابەستوە نازانم راست دەکا یان نا؟* ).

راپازنین : گوشینی جلی شۆراو.

راپازنین : گوشینی پەنیری تازە.

راتڵەقاندن : راوەشاندنی دەفرێک کە شتی وردی تێدا بێ : ( *سەیری کە وەک گەنم چلۆن کەوتیە ، گێژی بێژینگ و راتڵەقانی کەو* ) « خاڵەمین »

راتڵەکاندن : بزواندنی توندی کەسێک بۆ لە خەو هەستاندن.

راخزین : راخوشین،راکشانی ئەستێرە لەشەودا (شهاب).

راخزین : رۆیشتنی لەنەکاوی مار:(*مارێکم لەبەر راخزی*).

راداشتن : راگرتنی چرا بۆ ئەوەی خەڵک لە بەر شۆقەکەی بەرپێی خۆیان ببینن:( *چراکەیان بۆ ڕادێرە* ).+

**راداشتن** : بۆڕاگرتن :( *دوو سێوم بۆڕاداشتن وەری نەگرتن* ).+

**رادان** : ڕێگە پێدان.

**رادبە** : راتبەی فەقێ یان ، ئەوە کە قوتابی یانی ئاییبنی نان و پێخۆریان لە مالان کۆ دەکردەوە.

**رادەر** : وەپێش خۆدەر ، لەڕادانەوە هاتوە.

**رازبێژ** : راست وێژ.

**راست بەراست** : بەرامبەر،رووبەڕوو :( *راست بەراستی من یەکێک دیار بوو* ).

**راسپێران** : ئاکامی راسپاردنی کەسێک ، نەک راسپاردن.×

**راست کردن** : پەڕاندنی بەشێک لە حیساب بۆ خشت کردن : ( *ئەو ١٥ قرانە فڕێ دە و حیسابەکە راست کە* ).+

**راستە** : ولاغە بەرزەیەک کە کاتی پەڕینەوە لە چۆمی قووڵ خۆی بەسەر تەنیشتی سەرەوەی دا دەخا ( چەپ بێ یان راست ).

**راستەڕێ** : یەکسەر :( *راستەڕێ هاتوومە ئێرە ، نەچوومە هیچ مالێک* ).

**راشکان** : درەنگ بوونی شەو :( *شەو زرینگاوە راشکا ، شەیتان سامی لەخوا شکا* ) « هێمن »

**راقەنان** : کەوتنی داروبرەخت.

**راقەناندن** : بڕینی دار و هەڵکەندنی.

**راقەناندن** : بڕیتی یە لە خستن لە زۆرانی دا.

راکردوو هەلاتوو.

راکردە ڕاکردوو.

راگیر بەردەوام :( *خوا راگیر و راوەستاوت کا* ).

رانان حەستن :( *داریکی گەورەم رانا، دەبار داری پیدابوو* ).+

رانان خستنی بنیادەم بە زورانێ :( *دەگژی راچووم، رام نا* ).+

راو : سپیایی یەک کەلە دەم وچاوی ژنی دووگیان پەیدا دەبێ.+

راو : شیلەی هەنگوین.+

راوەک : توورەکەی خام کەبۆ پالاوتنی شیریژ و پەنیر و... بەکار دەبرێ. بە پالوینەی شیر ناگوترێ.×

راوەکانی : راوەکەو لەسەر کانیاو.

رایەخ : هەرچی رابخرێ بۆ لەسەر دانیشتن.

رایەلکە : شتێک کەچەند لکی لێ ببنەوە :( *رایەلکەی ئاو ، رایەلکەی جاسووسی* ) ، شەبەکە.+

رسقان : خۆگرتن، ڕووان ، گووران.

رشوو : ئەوەی لە رشانەوەدا بەدەمی بنیادەم دا دیتەوە.

رقبەرقە : پێشبرکە :( *وەرە رقبەرقە بکەین بزانین کاممان زووتر دەگەینە ئەو سەرە* ).

رمانە : رەمانە، رەفیسکە ، بن ئەژنۆ :( *بەم کارە داست دە رمانەی خۆت کرد* ).×

رمڵ : رەمل، رەلم، خیز، چەو.

رن : چن، بێستان ڕن ئەو کەسەیە کە هەموو

بەرمکـەی لـیٚ دمکـاتـەوه ـەک ئـەوه کـە هـەڵ دمکەنێتەوه.×

رنده : رمنده ، پارچە تەنەکەیەکی کون کونە پەنیری پیٚ ورد دمکەن.

روو : کەروو، برش :( *نانەکە رووی هیناوه* ).

رۆ : خۆر، هەتاو.+

رووبەر : « سطح » ، « مساحت » .

رووت بوونەوه : چل داکـەنـدن :( *ئاومکـە قـووله* رووت بـەوه *با* وهنیو *کەوین* ).+

رووخەک : زەوی یەک کـە ئـەگـەر چالی لـیٚ هـەلکـەنـدریٚ، دیوارەکانی تیٚ دەروخیٚ.+

روودار : بیٚ شەرم وحەیا :( *هینده روودار بووه تامی نەماوه* ).+

رووزه : جۆریک گرکەیە پیستەکەی زووره.+

رۆسەکنان : داسەکنان، ئارام گرتن.

رووشاڵ : چەرمی تەنک کە لە ئاکامی رووشـان دا لەلەش هەڵ دمبی :( *رووشاڵیکم لیٚ هەڵبووه* ).

رووشە : رووزه، جۆریک گرکەیە.

رۆقرمان : تیک قرمان ، تیک رووخان.

رۆقرماو : تیک قرماو.

رۆناس : رۆیناس، بنی گیایەکە ریسی پیٚ رمنگ دمکەن، رمنگی سووره و کاڵ نابیتەوه.

رمبناوک : سمل، بنەگیایەکە ژنان بۆ زینەت و بۆنـەکـەی ومخۆیانی دمخەن.

**رەپاڵ نان** : وەک جنێو بەکار دەبرێ ، یانی شتەکەی رەپاڵ دەنێ.+

**رەپن** : کزران، جێ یەک کە ئەگەر بارانیشی لێ بباریٚ نەبێتە قور.+

**رەپەرەپ** : تەپەتەپ .+

**رەجا** : تکا.

**رەجەبا** : رەنێو :( *ئەو هەمور توتنە بەکێ رەجەبا دێ* ، واتە بە کێ رەنێو دێ ).

**رەحم** : بەزەیی، دڵ نەرمی .

**رەخش** : ئەسپی بەناوبانگی رۆستەم :( *رەخش بۆ رۆستەمی ، گاران بۆ دووشەمی* ). « مەسەلی کوردی »

**رەزاسووک** : ئێسک سووک ، خوێن شیرین :( *لێو ئاڵن ، دەم بچووکن ، خوێن شیرینن ، رەزاسووکن* ) « هێمن »

**رەش بوون** : ئاو هەڵمژینی زەوی.+

**رەش بەشە** : جۆرێک مراوی یە.+

**رەش کردن** : ئاو دەزەوی کردن.+

**رەش کردنەوە** : کوژاندنەوەی حیساب لە دەفتەردا.+

**رەشکوژ** : رەشەکوژی، تیرور.+

**رەش وسپی** : هەرجۆرە کارێک :( *نایەڵم دەست لە رەش و سپی بدەی* ، واتە نایەڵم هیچ کارێک بکەی ).

**رەشە** : بانگ کردنی کەسێک کە رەنگی رەش بێ.+

**رەشەدار** : داری جەنگەڵ وەک دارمازوو و داربەڕوو.+

رەشە زیزانە : زیزانە رەشە ، زیزانە رەشکە ، دانیکی ورد و رەشە لەگەڵ گەنم دەکەوێ .

رەشەساڵ : ساڵی بێ بەفر.+

رەشەشەو : تاریکەشەوی ئەنگوستەچاو.

رەقاندنەوە : کوتانەوەی کانزا .

رەقاندنەوە : رەقـانـدنـەوەی دەوەن ( وەخـتـیک دەیانـەوێ دارستانیک بکەنە کێڵگە، دارەکانی لە ریشە دەردێنن . بۆ ساڵی دوایی رەگە دارەکان هەڵ دەدەنەوە . هەڵکەندنی ئەو غەڵفە تازانە پێی دەڵێن رەقاندنەوە ).

رەقاندنەوە : جنێو پێ دان :( *دایک وبابی رەقاندنەوە* ).

رەق کردن : رەپ کردنی ئالەتی پیاوان .

رەقەشۆ : تێرشۆ ، بووزوویەک کە وەختی رایەڵ کردن شۆ ، واتە سرێشی زۆر لێ بدرێ .

رەمە : کورت کراوەی « رەمەزان » ناوە بۆ پیاوان.

رەمەزان : مانگی رۆژوو ، نۆهەم مانگی ساڵی کۆچیی مانگی.

رەمەزان : ناوە بۆ پیاوان.

رەمەند : دیواری وشکەکەڵەک .

رەنە : بەستی دەم چۆم و رووباران.+

رەندۆڵ : رندۆڵ ، تیتۆڵ ، شیتاڵ ، دڕاوایی داوێنی کراسی ژنانە.

ریخن : منداڵی ئیسحال کە کز و لاواز دەبێ.

ریخەشلکە : فیڕاندن ، نەخۆشی یەکی ئاژەڵە کـــــە زۆر

وایە دەی کوژێ .

**ڕێژەن** : لووزەوی ئاو.+

**ڕێژەن** : نێرینەی چۆم ، جێگای هەرەقوول و بە تاقەتی چۆم .+

**ڕێژەو** : ڕێژەن، لووزەو.+

**ریشۆڵە** : زریزە، ئەو بەرەیە کە بەهاران گوێز و داری دیکە دەری دەکا و دوای ماوەیەک دەوەرێ .+

**ڕێک دەرچوون** : ڕێک هاتنەوە :( *یەکی دوو سێوم وێ دان ڕێک دەرچوون* ).

**ڕێ کردن** : جێگا کردنەوە بۆ دانیشتن :( *ڕێم کە با دانیشم* ).

**ڕێ کردن** : باش بۆ نیشانە چوون :( *تفەنگەکەم خانبرە و ڕێ یە ناکا* ).

**ڕێک ورەوان** : بە ڕاشکاوی :( *هەرچی یەک هەیە ڕێک و ڕەوان پێم بڵێ* ).

**ڕێک هاتنەوە** : بە قەد یەک هاتنەوە.

**ڕێکەوتن** : دەست کردن بە نان کردن :( *بەیانی زوو هەویرم شێلا و لەگەڵ تاو هەڵات ڕێ کەوتم* ).+

**ڕێگە** : ڕەگە.+

**ڕێن** : ڕێمان :( *هێشتا ڕێن زۆر لەبەر ماوە* ).

# پیتی ز

زاخاودانەوە : مشت ومالْ کردن :( خەنجەرەکەم تازە *زاخاو داوەتەوە* ).+

زاربلاْو : زار بەهاوار، قسە تیْ نەوەستاو.

زاربەهاوار : زاربلاْو، قسە تیْ نەوەستاو.

زاردروو : ئەو جەوالْ و تەلیسەیە کە پڕ دەکریْ جا دەدووریْ . بەکارەکەش دەگوتریْ زاردروو.

زاردروون : دروونی زاری جەوالْ و تەلیس.

زاردروون : بریتی یە لە بەرتیل پیْدان.

زاردروون : ریْگای قسەکردن بە یەکیْک یان بە خەلْکیْک نەدان .

زارەودەر : برینی ئەم دیو ئەودیو ، دیواودەر.

زارەودەر : ژووریْک کە دەرگاکەی لە رووی دەریْ بیْ، نەک لە دالاْن.

زاکوون : بڕشت،کارلیْهاتن.×

زامنە : ئامرازی داخستنی چەخماخی تفەنگ و دەمانچە.

| | |
|---|---|
| **زانین :** | لیٚ ئاگابوون، « دانستن ». |
| **ژاوابووک :** | چیایەکە لە نیزیک مەهاباد. |
| **زاوابەند :** | ئەو زاوایەی دەچێتە ماڵی خەزووری دەژی. |
| **زرنگانەوە :** | زرینگایەوە، نیشتنی خشت وخاڵی نێو ئاو.+ |
| **زڕنووق :** | چریسکایی رۆن لە سەر شۆرباو. |
| **زڕنیق :** | کانزایەکە. |
| **زڕوزبیل :** | زبڵ وزاڵ. |
| **زرەمەندیٚ :** | گیایەکە وەک مەندیٚ دەچیٚ گەڵای وردە. |
| **زریزە :** | ریشـۆلەی گـویٚز و داری لیٚڕەوار کـە بەهـاریٚ دەری دەکا و دوایە دەوەریٚ.+ |
| **زگ دان :** | دەرپەڕینی بەشێک لە دیوار کە نیشانەی رووخانیەتی:( دیوارەکە زگی داوە ). |
| **زگ مەشکەدۆ :** | زگ زل. |
| **زڵق :** | قوڵتی ئاو لە کوڵین دا :( زڵق زڵق دەکوڵیٚ ).+ |
| **زڵەموو :** | ئەو دانەدانە مووانە کە لە جیٚگای بیٚ موو وەک لامل و سەر و روومەت دەڕوێن. |
| **زلی بیٚ حونەر:** | بریتی یە لە کەسێک کە بە قەڵافەت گەورەیە بەڵام هیچ کارێکی لەدەست نایە. |
| **زمان پاراو :** | زمان رەوان ، بەدەم ودوو. |
| **زمان گەستن :** | هەست وەخەبەرهاتن :( کە ئەمەم دی زمانی خۆم گەست ، گوتم ئەم ماستە بیٚ موو نیە ). |
| **زمان لە بەری پیٚ دان :** | خەڵەتاندن ، فریودان. |
| **زمان لیٚ کوتان:** | بەدگۆیی لیٚ کردن لەلای دەسەڵاتدار. |

**زمان هەڵەنگوتن:** قسە لەزاردەرچوون.
**زمان هەڵەنگوتن:** لاڵەپەتەیی، قسە باش بۆ نەکران.
**زمبە :** شیشەی ساچمەزەن و تفەنگی رەشۆڵی.
**زمبە :** تمبە، دەنگی کەوتنی شتی نەرم و قورس.
**زنگڵ :** زەنگڵ ، قەترە :( *ئاونگ لەسەر کوڵمانی ویستاوە زنگڵ زنگڵ* ) « فۆلکلۆر »
**زووبەزوو :** خێرا خێرا.
**زوڕاد :** هەرزنە گەورە.
**زوورک :** جێ یەک کە بە ئاوی بارانە نابێتە قوڕ.+
**زورکان :** زوورک.+
**زووروو :** ئەو شتانەی لە خوری و موو دروست کراون : ( *بۆ زووروو یانی بۆنی سووتانی خوری و موو* ).
**زوێڵو :** زیڵوو، هەزارپێ.
**زەبروەشێن :** ئەوەی بەدەست و زەبرە و خەڵک لێی دەترسن.
**زەردوسوور :** تێکەڵاوی رەنگی جل وبەرگی ژنان : ( *زەرد و سوور تێکەڵاون ژن وپیاو هەرایە* ).+ «گۆران»
**زەردوماهـ :** شاخی حەستەم.
**زەردەقوڕی :** جورێک مارمیلکەی زەلامە.
**زەڵ :** جەگەن، گیایەکە دەکرێتە حەسیر.
**زەلیل :** بریتی یە لە کەسێک کە نەخۆشیی گولیی گرتوە.
**زەلین :** خووسانی زەوی ، ئەو زەوی یە کە ئاوی زۆری لێ نراوە : ( *بەجارێک زەلیوە* ).

**زەنگڵ** : زنگڵ، دڵۆپ، قەترە، زەنگۆڵ.

**زەنگە** : زرینگە، زرینگانەوە: ( *زەنگە نەبێ لـــە سەرم نایە*).+

**زێ** : ناوە بۆ دووچۆمی کوردستان :( *زێ یە چووک و زێ یە گەورە* ).+

**زەیقەتی** : تەنگانە، سەرما وسۆڵە یان بەفروباران هاوکات لەگەڵ نەبوونی زەمەڕیان ئالفی مالات.

**زیارەت** : چوونە سەردانی پیاوی گەورە.+

**زیان کردن** : زێن کردن، مەڕ وگاران لە مەزرای چێندراوی خەڵک کردن.+

**زیانەخۆر** : سەگێکە کە فیری دزینی مەشکە و دودانە و ... بووبێ .+

**زیروو** : کوڵکێکی سپی یە کە هێشووە بەرسیلە دەری دەکا و دوایە دەی وەرێنێ.

**زیروو** : بڕادەی ئاسن، ئەوەی بە کوتان یان بە بڕبەند لە ئاسن دەبێتەوە.

**زینڕەمەندێ** : زرە مەندێ، گیایەکە.

**زیلک** : ژیلەمۆ، پۆلی نیوەدامرکاو.

**زیوان** : کون لە مەشکەدا :( *مەشکەی چاکە زیوانی تێدا نیە* ).

## پیتی ژ

**ژارگرتوو** : ئەوەی شتی ژاراویی خواردوە ، ئەوەی خواردنی کۆنی خواردوە و پێی نەخۆش بووە.

**ژانبڕ** : ژانبەر، لەجیاتی « مسکّن » بەکاربراوە.

**ژاندارم** : پۆلیس، ئەمنیە.

**ژنۆکە** : ژنی نابووتەکە، « تصغیر » ی ژنە.+

**ژەم بوردوو** : جەم بردوو، ژەم مردوو.

**ژەمک** : جەمک.

**ژەرەمار** : جنێوە، وەک قوززەڵقورت و سندان.

# پیتی س

سارده : جۆرێک کوانه زۆرجار نەخۆشی پێ دەمرێ.
ساردەبرین : برینی کۆنی وەژان هاتوو.
ساردەکێڵ : جووت کردن و تۆو چاندن له ئاخری پاییزدا.
ساردەکێڵ : ئەو دەغڵەی له ئاخری پاییزدا دەچێندرێ.
ساردەوەبوون : ساردبوونەوە.
سازوباز : حازر و ئامادە.+
ساقۆڕ : برینی زۆرگەورە.+
ساڵبڕ : ساڵ بواردن :( هەموو *ساڵێ* بەسەرم دەکاتەوە، *ساڵبڕی* نیە ).
سامان : خۆیانی کۆکراوەی گەنم و جۆ.+
سامۆتە : ئەڵقە وبەنێک کە له پاشکۆی زین قایم دەکرێ و شتی پێ هەڵ دەگیرێ .
ساندن : ئەستاندن ، بەزۆر ئەستاندن .
سایەچەور : ئاغایەک کە رەعیەت له دێ یەکەی دا دەوڵەمەند دەبوون.+
سپیتەڵۆک : دارێک کە بێ ئەوەی بڕابێ وشک بووبێ و

توێکڵەکەی لێ بووبێتەوە.

سپیلکە : ئەو دەنکە گەنمانە کە پاش گێرەکران لە توێکڵەکەیان دەرنەهاتبن :(گەنمێکی خاوێنە بەڵام سپیلکەی زۆرە).+

سپیلکە : هێندێک گەڵای سپی یە لە نێو چادا. چایەک سپیلکەی زۆر بێ بە پەسند دادەنرێ.+

سپیەڕۆژ : ڕۆژی نە هەور و نە ساو کە کەشەهەوری سپی بە بەری ئاسمانەوە بن.

سپیەڵۆک : سپیتەڵۆک .

سپیەهەرمێ : جۆرێک هەرمێ یە.

سرۆ : ئەسرۆ، شاخی حەیوانات.+

سرووت : وردەی ئەو شتە کە مشک خواردوویە.+

سژین : ژانی برین لەگەڵ خورووا.

سلاوئەستاندنەوە: جوابی سلاودانەوە.

سمۆرە : فارسی یەکەی « سنجاب » ە نەک «سمور» .×

سمە : پاشگرە بەمانای کونکەر :(کەندسمە).+

سند : تۆپەڵە گڵ یان وردە قەند و...ی پێکەوە نووساو: (سندەگڵ ، سندەگەزۆ).

سندان : نەخۆشی یەکە ئەسپ و ماین و کەر دەی گرن.+

سندە : سند.

سنگ ڕەپێش
کردن : خۆنواندن، سنگ دانەپێش .

سۆ : کوانێکە لە ڕەشەولاخ دێ .+

سوار : تەنگ :( پشووسوار واتە پشووتەنگ ).+

سواڵە : مەلۆی گەنمی دروێنەکراو. پڕی دەست «دەسکەسواڵە»یە.×

سوانە : لێواری باپڕوو ، لێواری پڕووبەفر.+

سووت : پاشگرە بەمانای سووتاو :( تاوەسووت بووە ).

سۆدرە : گاڵتەجار :( گورگ ئەگەر بیربوو دەبێتە سۆدرەی سەگان ). « مەسەلی کوردی » +

سوورازە : گیایەکی کوێستانە لەگەل شیرێژ تێکەل دەکری و دەخورێ .

سوورکە : بن گەڵای توتن کە بە برکەکەیەوە وشک بێ ، یان بە بێ بە شیشەوە کردن وشک کرێ .+

سوورکە : جانەوەرێکی چووکەڵەی رەنگ سوورە.+

سورمەرێژ : چاوی پڕ لە کل .+

سورمەیی : جۆرێک قوماش بوو.+

سوورەپنگ : گیایەکە گەڵاکەی وەک پنگ دەچێ بەڵام ناخورێ.

سوورەپەل : دار و دەوەنێک کە پاییزان گەڵاکەیان ناوەرێ و هەر بەوێوە سوور دەبێ .

سووکەخەو : خەوێکی کەم.

سوێ بوونەوە : تامەزرۆیی زۆر بۆخواردنێک یان شتێکی دیکە: ( بۆ گۆشت کەوێک وەختە سوێم بێتەوە ).+

سوێق سوێقەدان: تامە تامەدان ، ئیشتیا بزواندن بێ ئەوەی خواردنی لەگەل بدرێ .

سەبنیسی : بریتی یە لە مەلامەتی توند.+

**سەبەتەپانکە** : سەلە ، سەبەتەی وەک سینی.
**سەبەتەقووڵکە** : سەبەتەی قووڵ کە هەور و هۆڵی تێ دەنێن.
**سەحەرە** : مەقامێکی خۆشی کوردی یە.
**سەحەندی** : بەلفی ، جامی پەل .
**سەر** : پیر :( *ئەم مانگایە سەر بووە ، بی فرۆشی باشترە* ).+
**سەر** : لووتکە ، بەرزایی :( *تاو لە سەرانی داوە* ).+
**سەرئەسپانە** : مالێکە کە لە کاتی بووک دابەزاندن دا پێی دەدرێ.
**سەرئەستووربوون** : وەرەزی لە بەر بێکاری .
**سەراسوێ** : بریتی یە لە بەسەر کردنەوە :( *سالێکە سەراسوێت نەکردووین* ) « سەرابەسوی » یش دەگوترێ .+
**سەراوەرد** : لەگەڵ سنوور دەگوترێ « سنووروسەراوەرد » ، کەوشەن ، حدوود.
**سەربردە** : سەرگوزشتە ، بەسەرهات .
**سەربڕین** : بریتی یە لە بڕینەوەی سەودا :( *بە هەزارتمەن سەرمان بڕی* ).+
**سەربزاوتن** : بێ ئەمری کردن :( *فێری سەر بزاوتن بووی ، ئەمرم سەرت نەرم دەکەم* ).
**سەربەتاڵ** : قسەی ناخۆشە بۆ ژنان :( *دەڵێ دەگەڵت نایەم سەربەتالی مە بە کوێن* ). « فۆلکلۆر »
**سەربەسۆ** : ئەو کەسەی لووی بە سەرەوە بێ .
**سەربەهەش** : سەربەخەم ، بریتی یە لە تازیەبار.

**سەربەهەوێ** : ئەو ژنە کە بەسەر ژنێکی دیکە چووە. هەردووکیان « هەوێ سار » ن .×

**سەرپێکەوەنان** : بریتی یە لە سرتە کردنی دوو یان چەند کەس پێکەوە.+

**سەرپێوەنان** : هەوڵ بەر پێ گەیشتن :( *رێواس سەری پێوەناوە* ).+

**سەرجەلە** : شەجەرەنامە.

**سەرچۆپی کێش**: ئەو کەسەی لە داوەت دا سەرچۆپی دەگرێ : ( *لەگەڵ تۆمە سەرچۆپی کێش* ). « فۆلکلۆر »

**سەرچوون** : چوونەسەر :( *سەرچوونی تەخت ڕۆینی سەرداری پێ دەوێ* ) « سەیف » .+

**سەرخستن** : خستنەسەر ، لێ زیاد کردن.+

**سەرخەت** : ئەم سەر و ئەو سەری خەتەجووت .+

**سەرخەت** : سەردێر ، سەرمەشق .+

**سەرداو** : دژی بن داو لە مەکینەی خەیاتی دا.+

**سەردڕ** : بەشێک بووە لە بووزوو کە لە جیاتی هەقدەست دراوە بە جۆلاً.×

**سەردەستە** : سەرقۆڵی کراس و کەوا.+

**سەردەسوێ نان**: سەرپێوەنان ، تازە پەیدا بوون.

**سەردەسوێ نان**: سەرپێداگرتن و تەماشا کردن لە پەنا و پەسیوان را.

**سەردەمکە** : سەردمکە ، سەرپۆشی منداڵی لە نێو لانکەدا کە راستی دەم وچاوی بەرزە.

**سەردێر** : چاندی تۆو و پاشان ئاودانی .

سەڕرا : باقی ، باقی دانەوە :( *سەعاتەکەم لەگەڵ بگۆڕەوە سەد تمەنت سەڕرا دەدەمەوە* ).

سەڕڕەشە : گیایەکە ، بە بنەکەی دەڵێن رەبناوک .+

سەڕزار : سەرپۆش ، دەرخۆنە ، ئەوەی لەسەر دەفر و ئامان دادەنرێ.

سەرسنگ : سنگی مریشک و پەلەوەر :( *گۆشتی ران خۆشترە یان گۆشتی سەرسنگ* ).+

سەرسۆنگە : شێنەیی، بەکاوەخۆ :( *ئەم کارە بە پەلە ناکرێ، بە سەرسۆنگە باشتر دەکرێ* ).

سەرشان : قایشی سەرشانی فیشەکدان.+

سەرشانە : بەرپرسی شانەی حیزبی.+

سەرشۆر : قەرەواش ، ئەو ژنەی بۆ خزمەتی خانمان رادەگیرا.

سەرکردن : تیژبوونی تیغ :( *وەها تیژ دەبن سەردەکەن ، فتوای کافریم دەردەکەن* ).+ « هەژار »

سەرکردن : سەری تووتن وگیای دیکە قرتاندن.+

سەرکردن : قیمەت بۆ دانان :( *ترێ یەکمان یەک و دوو بەگەنم سەر کرد* ).+

سەرکردن : وەسەر کردن :( *باراشەکەت سەرکە نۆرەتە* ).+

سەرکردنەوە : کەمێک راکشان ، سەرخەو شکاندن.+

سەرناس : پسپۆڕ ، ئەو شوانەی حەیوانەکان باش دەناسێتەوە.

سەروخوار : هەوراز چوون و داگەڕانەوە :( *سەعاتێکە سەروخوارێ دەکەم* ).+

**سەرروودەروو** : سەروسامان :( *ماڵێکی بێ سەروودەرووییە* ).

**سەرروشەدە** : سەر بە شەدەوە ، سەر بە پێچەوە.×

**سەرروقوون** : سەروین :( *پیوازەکان سەروقوون بکە واتە سەروبنیان لێ بکەوە* ).

**سەرەشکێنە** : سەرشکاندنەوە :( *ئەوەندە سەرەشکێنەی ئەم منداڵە مەکە* ).+

**سەرەقەند** : بنی خڕ و باریکی کەللە قەند :( *کابانی دەوڵەمەندێ ، مەمکت وەک سەرەقەندێ* ). «فۆلکلۆر»

**سەرین** : لای سەر ، دژی پێ یین بە مانای لای لاق . زیاتر بۆ قەبر و جێی نەخۆش بەکار دەبرێ.+

**سەرینگار** : قەراخ ، سنوور :( *لە سەرینگای زەوی یەکەی ئێمە هێندێک گیا بدروو* ).

**سەغڵەتی** : تەنگانە.

**سەڵا** : بەڵا ، نەفرین :( *سەڵا لە ئەقڵت* ).+

**سەڵبە** : بێڵی کەڵەک لێ خورین.

**سەمەڵ** : لاسکە گەنمی گێرەکراوی ورد نەبوو :( *سەمەڵی تێدا ماوە* ).+

**سەمەڵ** : لاسکە کەنم کە بۆ ئاخنینەوەی کورتان هەڵ دەگیرێ.+

**سەوزەڵەخانم** : ناوی گۆرانی یەکە :( *کنیچ لە باخەڵم دا سەوزەڵە خانم دەڵێ بۆ قرانێک* ). « مەسەلی کوردی »

**سەوەڕ** : سەگ وەڕ ، وەڕینی چەند سەگ پێکەوە.

سەوەریخ : سەوەگوو ، بریتی یە لە ورگنی زۆرخۆری کارنەکەر.+

سێ بەنگی : بۆ کەزیە دەگوترێ ، مەبەست سێ لیزگەیە : ( کەزیەت کردوون سێ بەنگی ). × «فۆلکلۆر»

سێچکە : بەرێکی دارمازوویە ، بۆ خۆش کردنی پێست بەکاردێ .

سیخورمە : نقورچ ، نقورچک .×

سێ دەری : پەنجەرەی سێ تایی .×

سیرمۆکە : گیایەکە وەک کەوەر و کوڕادە،سیرەکێویلە نیە.×

سیرمەکێش : بریتی یە لە ئازار و جەزرەبەدان :( وەڵڵا سیرمەکێشت دەکەم ).

سێرە : نیشانەگرتن :( سیرەم لێ گرت و تەقەم لێ کرد ).+

سێرە : سەرنج :( سێرەم دایە ).+

سیرەت : بۆ کیری منداڵ و پیاوی گەورە بەکاردەبرێ نەک هەر بۆ منداڵ .×

سیسرە : دەعبایەکە وەک کوللە ڕەشە ، لە خانوان دا دەژی، جاجم و پۆپەشمین و بەرماڵ ناهێڵێ.+

سێ کوت : ئەوەیە کە لە سێ بەشی بەرهەم ، دووبەشی بۆ رەعیەت و بەشێکی بۆ ئاغا بێ ، پێچەوانەی سێ یەک .

سیکەرۆ : جۆرێک هەڵووچەی ترش و وردە.

سێ گر : مشەخۆر، مفتەخۆر:( بوویە سووری سێ گر؟).

سێ گۆ : جۆرێک گوارەیە :( گوڵم تۆ مەگری بۆ گوارەی

سێ گۆ ، ناربووومه بۆت بێ له هەولێر و کۆ )
« فۆلکلۆر »

**سیواد** سپیایی بەیانی وسوورایی ئێواران :( *سیوادی هەڵ دا* ).+

**سیوسیوه** : ئەو داره یان ئەو ئاسنەیه که لەم سەرئەوسەری باگردان دەکرێ و پێی دەگێڕن .+

**سیوەڵووکه** : باڵندەیەکی بچووکی دەندووک خواره ، وەک باشوو.

**سیوەڵووکه** : گیایەکه بنێکی چووکەڵەی هەیه شیرنه و دەخورێ .

# پیتی ش

**شاکەشاک** : هەڵپە و پەلەپەل ، وەپەلەقاژە کەوتن.×

**شاگوڵ** : جۆرە گوڵێکە.+

**شام** : قامیش.+

**شامات** : قامیشەلان.+

**شان داخستن** : مل دانە کار :( *شانی لێ داخست تا تەواوی نەکرد دەستی لێ هەڵ نەگرت* ).

**شان وباهۆ** : شان وباسک، هێزی دەست و پەنجە:( *لە شان و باهوی خۆم ڕادی* ).« هێمن »

**شباندن** : شێوە کردن :( *بە کەسێکی دەشبینم ، نازانم هەوە یان نا؟* ).×

**شتران** : شووردران، ( شستە شدن ) .+

**شخرە** : شەغرە، بارە گیایەک کە باقە باقە بە گوریس لێک بەسترابێ.×

**شخەڵ** : نەمامی دووسێ ساڵەی داری لێڕەوار.×

**شڕم بڕمێن** : تێکەڵ پێکەڵی ، بێ سەرەوبەرەیی.

**شڕ و وڕ** : ڕووتەڵە،دڕاو.

**شک بۆچوون** : گومان له کەسێک کردن له دزی و کاری خراپ دا :( شکم بۆ نادر دەچێ ).

**شکرانه** : سوپاس ، شوکر.

**شکرانەبژاردن** : سوپاسی خوا کردن، شوکری نیعمەت .

**شکرانەکردن** : شوکری نیعمەت .

**شکست** : شکاو ، دۆڕاو له یاری دا.+

**شکڵ** : بریتی یه له شتی شۆخ و شەنگ :( ئەسپەکەی دەڵێی *شکڵه* ).+

**شک لێ بوون** : شک بۆچوون .

**شک لێ کردن** : گومان له کەسێک کردن که کارێکی خراپی له بن سەردا بێ.

**شکۆ** : شەرم :( شکۆیه مەکه ، به *لەباری نان بخۆ* ).+

**شکۆ** : پارێز ، « احتیاط » :( به شکۆوه چوومه *ژوورێ* ).+

**شڵپ وهۆڕ** : دەنگی خۆ له ئاو هاویشتن و یاری پێ کردنی ئاو.

**شلووق** : ئاڵۆز، نەحەجمیو :( *ماشەڵڵا منداڵێکی شلووقه*).+

**شلەپەتە** : ئەو کەسەی ناتوانێ ببێته زاوا ( عنین ).+

**شلەخەجێ** : ناوی گۆرانی یەکی کوردی یه.

**شملێ** : بەری گیایەکه دەبرژێ و دەهاڕێ لەگەڵ نان و کولێرەی دەکەن ، بۆنی خۆشه.×

**شن** : دارێکی لێرەواره گەڵاکانی ورد و خشتن.+

شوانەوێڵە : شوان، ئاژەڵدار، ئەو کەسەی کاری شوانی یە.
شۆپ : قوون، کونی پاشەوە.+
شۆرەک : رەوان، ئیسحال.+
شە : دەفەی جۆلایی نیە، بەشێکە لە دەفە کە لە نزیک سەد پەڕە قامیش دروست کراوە و رایەڵی پێدا دەڕوا.×
شەتڵ : شەلاڵ :( شەتڵی خوێن هەروەکوو شێخی شەمزین ). « هەژار » +
شەخسە : شەختە.
شەخسنە : ناوە بۆ پیاوان .
شەرت وبێ شەرتی: بێ وەفایی ، پەیمان شکێنی :( شەرت و بێ شەرتیت مەعلوومەی *داوە ، داخوا لە کوێی تر بنیاتت ناوە* ). « فۆلکلۆر »
شەش قامک : کەسێک کە شەش قامکی لە دەستان بێ.
شەشلان : شەشەکان ، مانگی دوای رەمەزان .
شەقاو : هەنگاو ، هەنگاوی ئاسایی.+
شەقاوشل بوون: ماندووبوون.
شەقەکێش : برینەوەی دار بە شەقەمشار :( شەقەکێشی *نەکەی ناقەڵشێ* ).+
شەکر لە دەم دا بوون : قسە لە بیرمان :( ئەتۆ شەکرت *لە* دەم *دا* بێ، واتە قسەی خۆت لە بیربێ تا من قسەی خۆم دەکەم ).
شەکرە : گوێنی یەکە کە شفرەی لێ دەدرێ بۆ کەتیرە ،

زەردە گوێنی نیە.×

**شەکی** : چەرمی رەق هەڵاتوو.+

**شەکی** : دارێکی لێرەوارە لە بنەماڵەی بەڕوو کە گەڵاکانی زۆر پانن.

**شەلایی** : تەڕانی و شینایی دەم چۆم.

**شەڵتە** : خەرار، یان تەلیسی گەورەی کاکێشانە ، نەک رەشکە.×

**شەلکە** : ئاژەڵی شەل ( بیست سەرم شەلکە *لە ماڵێ گێراوەتەوە* ).+

**شەمسی** : سەهۆڵی بەرهەتاوی زستان کە دەرەنگ دەتوێتەوە.

**شەوادی** : دووشەو بەرلە ئێستا ، واتە « پریشب » ی فارسی نەک « دیشب » .×

**شەوبێر** : دۆشینی مەڕومالات لە شەودا ، کە زیاتر پاییزانە.+

**شەوترادی** : سێ شەو بەرلە ئێستا ، شەوی پێش پێرێ شەو.

**شەوڕامووسان** : ماچی شەوانە لە جێ ژوان .

**شەوزستان** : یەکەم شەوی زستان ، « شب یلدا ».

**شەوکار**: ئەو کەسەی لە جیاتی رۆژ بە شەو کار دەکا.+

**شەوهەینوو** : سواڵی شەوانی « جمعە » .

**شەهوەت** : ناوی پیاو ، مەنی .

**شەهوەت** : هەوەس ، ئارەزووی جینسی .

**شیپەر** : پۆلە دەوەنی چڕ .

| | |
|---|---|
| شێت ویێت : | کەسێک کە لە خۆوە تووڕە دەبێ و دەتۆرێ . |
| شیخاڵ : | پەڵە هەوری سپی و درێژووکە.+ |
| شێرانەوە : | شاردرانەوە، لەبەرچاو ون بوون.× |
| شیراوشیر : | شیردانی مانگا دوازدەمانگ بێ ئەوەی کاتی ئاوس بوون وشک بکا. |
| شیردۆش : | ئامرازێکە لە مەمکی ژنی تازەزاوی دەکەن بۆ ئەوە شیرەکەی هەڵ دۆشێ.+ |
| شیرشیرۆکە : | مژمژە، گوڵی گۆزروان کە منداڵ دەی مژن و شیرێکی شیرنی تێدایە. |
| شیرن گرێ : | کەسێک کە گرێ یە ، بەڵام پێی ناشیرین نەبووە و لێی جوانە.× |
| شێروخەت : | هەڵاویشتنی سکە و گرێو کردن کە بەکام لا دا دەکەوێ. |
| شێرە : | قۆڵ ، هێندێ داری درێژن لە ئاخر چینی دیوار دەنرێن بۆ ئەوەی داری سوانەیان بخرێتە سەر.+ |
| شێرەبەردینە : | پەیکەری شێر لە بەرد :( شێرە بەردینە لە جێی پەرژینە ). « هێدی » |
| شێرەبەفرینە : | پەیکەری شێر کە لە بەفر دروست کرابێ . |
| شێرەبەفرینە : | بریتی یە لە کەسێکی بە رواڵەت بەدیمەن ، بەڵام بێ غیرەت و ترسەنۆک . |
| شێرەخۆرە : | بە زیپک و زاگون ( دەڵێی شێرەخۆرە نەبێ؟). |
| شیلمان : | ئاسنی خانوو پێ دروست کردن، « تیرآهن ». |
| شیلە : | ددانی سێ ساڵەی یەکسم کە لە شەش |

سالی دا دەکەوێ.+

**شیلەگرتوو** : بێستانی دێمەکار کە پاش داچاندن بارانێکی کەمی لێ بارییبێ.

**شین بوونەوە** : لە نەکاو دەرکەوتن، لەنەکاو پەیدابوون :( *لەنەکاو لێم شین بۆوە* ).+

**شێوەخوار** : ئەو گیایەیە کە بۆ خواردنی شەوی ولاغ دەی هێننەوە .×

**شیوەلە** : قەڵەو، قەڵەوی پاش کزی :( *شیوەلە بووە ، شیوەلە بۆتەوە* ).+

# پیتی ع و غ

| | |
|---|---|
| عادڵ : | ناوە بۆ پیاوان.+ |
| عارف : | تێگەیشتوو، ئاقڵ:( بۆ *عارفان* حەرفێک بەسە) « فولکلۆر ».× |
| عارەقگیر : | عارەقچن .+ |
| عالوسال : | پشو لەسەرخۆ ، مەند ( اهل و سهل ).× |
| عەبرەش : | هەبرەش، ئەبرەش، لە تینوان وشک هەڵاتوو.+ |
| عەلەم : | ئەخۆشی ، ئەساغی ( الم ) :( *عەلەمی لێ براوە* واتە چاک بۆتەوە ).× |
| عەلیخانی : | جۆرێک شەدەی سوورە، جۆری مشکی .× |
| عەماراو : | عەمباراو، بۆشکەی لە کانزا سازکراو بۆ ئاو تێدا هەڵگرتن.+ |
| عەمارتە : | خانوویەکە بە ئەندازەی نهۆمێک دیواری بۆ کرابێ و پڕ کرابێتەوە بێ ئەوەی بکرێتە ژێرزەمین ، ئەمجار نهۆمێکی ساز کرابێ.× |
| عیو : | هۆپ، وشەیەکە بۆ لێک لەهەرادان. |
| عیواوعیو : | وشەیەکە لەجوابی عیودا دەگوترێ. مەبەست لە |

هەرادانەوەیە.( بۆ ئاشنایی دوو دڵداریش ئەم

غڵدەغڵد : دوو وشەیە بەکار دەبرێن.)

دەنگی نامەفهووم کە لە گەرووی نەخۆش

غوراب : دەبیستری .

غوربەتی : جەرگە، جەنگە :( *لە غورابی خەوێ دا* بووم ).

بەزەیی ، دڵ نەرمی :( کە چاوم پێ کەوت

غەڵەبایی : غوربەتیم *هەستا* ).

ئاپۆرا ، زۆرایەتی :( *غەڵەبایی خەڵکەکە لە*

غەم ڕەوێن : *بەردەرکی مزگەوتی سور بوو* ).

منداڵی خۆشەویست ، یان دڵدار :( *لە لای*

*دایکم بە تو بۆ غەم ڕەوێنی* ). « هێدی »

# پیتی ڤ

ڤاب : ١ـ جۆرێک تۆزی جلک شوتنە ٢ـ بۆتە ناو بۆ هەموو جۆرە تۆزێکی جلک شوتن .

ڤاتمۆکێ : بانگ کردنی فاتم ناوە بەخۆشەویستی یەوە.×

ڤاتمۆکێ : گۆرانی یەکی کۆنی کوردی یە.+

ڤاتمیلێ : بانگ کردنی فاتم ناوە، بەخۆشەویستی یەوە.×

ڤاماندن : تێگەیشتن .

ڤام کردنەوە : سەرەتای ئەقڵ پەیداکردنی منداڵ :( *تازە ڤامی کردۆتەوە* ).

ڤامە : ناوی ژنانە ، چووک کراوەی « فاطمە » یە .

ڤامین : تێگەیشتن :( *زۆر دەڤامێ* ).

ڤجوو : هەڵفرینی کەو.

ڤچک : سەرتێ هەڵدانی بێچوو لە گوانی دایکی لە کاتی مژین دا .+

ڤراژوو : هەراش ، پێگەیشتوو ، ڤراژی .

ڤرڤرە : دارێکی کورتی دە سانتی میتری یە ، بەنی دەنێو بەندی دەخەن و بە دەست هەڵی

دەسووڕێنن .+

**فرهاوێژ** : ئەو کەسەی بە شیعر جوێن دەدا .

**فرێت** : رایەلە ، نەک تێوەدان .×

**فسکەفسک** : پچەپچ ، سرت و خورت.

**فسۆس پاڵەوان:** فس فس پاڵەوان ، خۆهەڵکێشی بێکارە .

**فشقاندن** : دەنگی گەورەی هێندێ حەیوانات وەک بەراز.

**فشق و هۆڕ** : فشقاندنی زۆر.

**فشقەفشق** : فشقاندنی زۆر.

**فلقوهۆڕ** : یاری یەکە ، سکەی چووک وەک تاقرانی بە تەختەوە دا دەکەن و بە سکەی گەورە تێی دەگرن .

**فوولەدۆنەکردن** : لە حەلاڵی و حەرامی نەپرسین :( *هێندە فوو لە دۆی ناکا ، چی دەست کەوێ دەی خوا* ).

**فەتەرات** : هیلاک ( *سەری بە فەتەرات دا* ).+

**فەراق** : حەیات ( *فەراقی لێ بڕی واتە کوشتی* ).+

**فەرخە** : ناوە بۆ پیاوان .+

**فەڕوفەساڵ** : تەرح و دیدار، سەروسیما :( *فڕوفەساڵت جوانە !*) « بەتانووتەوە ».

**فەڕۆفیک** : خێروبەرەکەت :( بە تانووتەوە دەگوترێ ئەم تەرزمیە فڕۆفیکی تۆ بوو ).

**فەلەی بێ دەنگ:** جۆرێک گەمەی مندالانە، هەرچی دەنگ بکا دەی دۆڕێنێ.

**فیجان** : فیزان.

**فیزان** : هەڵدڕانی توێکڵی تووڵەبی ئەو کاتەی دەیانەوی

به پیپلاره دەری بێنن .+

**ڤیزان** : هەڵدڕانی خەڵفی دار کاتێک دای دەنێن بۆ گۆچان ، ڤیجانیش دەگوترێ .+

**ڤیشەکە شێتە** · بریتی یە لە بنیادەمی نەحەجمیو .+

**ڤیقاندن** دەنگ لێوە هاتن لە ژێر فشاردا .+

**ڤینار** : ڕاکردن، هەڵاتن ، لە « فرار » ی عەرەبی یەوە هاتوە .

# پیتی ق

قاپڕەش : پێ ڕەش ، پێ وقەدەم شەڕ، بەدیومن.+
قاپووڵە : دەفری زۆر چووک.+
قاپسوور : قەوان ، قاپۆڕ.
قاڕ : ڕق ، قین ( قهر ).
قاڕنە : لێدانی تۆپ بە دار بە جۆرێک کە بەرەو بەرزایی بچێ و یاری کەرانی « طرف مقابل » بتوانن بی گرنەوە.+
قاشاخ : تێکوڵی گەنمەشامی.+
قاشاغ : قاشاخ.+
قاشتن : ڕاکردن، غاردان . ڕەنگە لە تورکی یەوە هاتبێ بەڵام لە ناوچەی سەردەشت زۆر دەگوترێ .
قاڵتاغ : ئاتەکی زین .+
قامچ : قەمچیش دەگوترێ ، ئاست ، حاند، شوێنی دیاری کراو.+
قان : لە یاریی مێشێن دا هەرکەس چوار پوولی دۆڕاند، پوولێکی دەدەنەوە یاریی پێ بکا، پێی

دەڵێن قان .×

قانگەبەرد : کانەبەرد، ئەو جێ یەی بەردی باشی بۆ خانوو لێ دەردێنن.

قاڵچخ : شوێنی درواوی دەغڵ ودان کە لە پێی بنیادەم رادەچی.×

قاڵچغ : قاڵچخ.

قاڵداسوو : داسووکەی گوڵی وشکی دەغڵ ودان.

قدووم : پـێ وقـەدەم :( قـدوومت خـێرە ئـیشـەڵلا نەخۆشەکەت چاک دەبێتەوە ).

قرتێ خستن : ئاسەواربڕین،جووقەواربڕین،کوشتنی بەکۆمەڵ .

قرتێ کەوتوو : وەک تووک و جنێو لە دژی منداڵان بەکـار دەبرێ :( بۆ بێدەنگ نابن قرتێکەوتوو ) .

قرچ : دەنگی شکانی چیلکەوچاڵ لە بن پێ دا.+

قرچۆک : دارێک کە زۆر ناسکە و بەئاسانی دەشکێ.+

قرخ : دارودەوەن کە لە جێگای رەقەن دەڕوێ و زیاد ناکا.+

قرخاندن : دەنگ لەگەروو هاتن وەک ئەوەی بخنکێ.+

قرژ : پنچکە داری پەل وپۆ ئاڵۆز.+

قرژاڵبڕ : کونێک کـە قـرژاڵ لە لێواری جۆگەی دەکـا و دەبێتە هۆی خەسار بوونی بەشێک لە ئاوەکە.+

قرژوقاڵ : پەل وپووش، چیلکە وچاڵ.

قرژە : جۆرە پنچکە دارێکە کورت و پڕ لک وپۆ.+

قرژەرەشکە : قرژە.

قرساندن : هەڵدروونی نێوقەدی کراسی ژنانە بە مەبەستی

کورت‌کردنەوە.+

**قرم** : قورم، دووکەڵی خانوو.+

**قرنجاندن** : قرساندن،هەڵدروونی کراس بۆکورت کردنەوە.+

**قروسکە** : دەنگی سەگ کاتی ئازارگەیشتن.

**قرهاتن** : بریتی یە لە نارەحەتیی زۆر لە ئاکامی برسیەتی، یان تینوێتی دا.+

**قریشکە** : دەنگی تفەنگ :( *قریشکەی برنۆی هاتە بەر گوێ زراوی چوو* ).+

**قژمقژ** : تررووسکانەوەی پۆلووی ئاگر.

**قسەبڕین** : قانیع کردن.+

**قسەتڕن** : کەسێک کە قسەی تاڵ وناخۆش دەکا.

**قسەڕۆییو** : قسەڕەوا.

**قسەلەزار**

**دەرهێنان** : نهێنی پێ درکاندن.

**قسەلێ وەرگرتن**: بەگوێ کردن.

**قسەلێ وەرگرتن**: نهێنی پێ درکاندن.

**قشپیلانە** : خنجیلانە.

**قشپیلە** : خنجیلانە.

**قلاشکەری** : داری لێرەوار کە قەلاشرابێ بۆ سووتاندن. بە داری ئەستوور ناگوترێ.×

**قلاقەپ** : قەلاقەپیش دەگوترێ، قرۆقەپ،قسە نەکردن.

**قماو** : زەوی یەک کە وەختێک ئاوی تێ دەگرن بێ ئەوەی سەرەوەی تەڕ بێ لە ژێرەوە تەڕ دەبێ.

**قوپەن** : چووزەرەی هێندێک گیا وەک کەنگر و کەما و

مەندیٚ، پێش ئەوەی گەلا بکا.+

قۆتان : کوتان، جێگایەک کەبەتانە دروست دەکریٚ و کا و گزرەی تیٚ دەکەن.+

قوتک : گرد، تەپۆلکە، گێوی چووک.+

قۆچاغ : قوچاغ، بەدیمەن، جوان چاک.

قۆچەکانی : قۆچەقانی.

قورپەست : داپۆشینی بانی خانوو بە قۆڕی گیراوە.+

قۆرت : پێچی جادە و ریگا.+

قۆرت : بریتی یە لە فێلٚ وگزی :( پیاوێکی بە قورت و پێچە ).+

قورس : خواردنێک کە درەنگ هەزم ببیٚ.+

قورس : ئاهەنگی گۆرانی کە پشووی درێژی بویٚ.+

قورسە : سندە، شەکر یان دانەوێلە کە نمی کێشابیٚ و بووبێتە کلۆ :( قورسەی بەستوە ).+

قورەپەست : قوڕەبان.

قوزەگامێش : بریتی یە لە پیاوی بێکارە و هیچ لە دەست نەهاتوو.

قۆشە : ئینسانی بەدفەڕ و ناجسن.+

قووقە : خوێندنی کەلەشێر.

قۆلٚ : لوولە کوورە، لوولە سۆبە.+

قۆلٚ : دارێکە لە دیوار دەگیریٚ بۆ ئەوەی داری درێژی باوێژرێتە سەر بۆ دروست کردنی سوانە.

قۆلتر : کز و لاواز و پیر:( بارگینێکی قولترپی هەیە ).

**قۆنگره** : کونی ئەستێری ئاو.+
**قوونەجووڕە** : قوونە مرغە.
**قوونەجووڕە** : قوون بزاوتنی کەسێک کە بۆ ڕۆیشتن بە پەلەیە.
**قوونە خشکە** : ڕۆیشتن لە سەر سمتە، نەک ڕۆیشتنی بە ماتەماتە.×
**قوونە مرغە** : ئێسکی قوونی باڵدار.
**قۆیتاس** : ناوە بۆ پیاوان.
**قەباڵ** : نەزر :( ئەو شتەم دەقەبەڵ *تۆ* کرد واتە نەزرم کردی بە خۆڕایی ).+
**قەپاڵە** : جارێک گاز لێ گرتن و پچڕین :( بە *قەپاڵەیەک* نیوەی *سێوەکەم پچڕی* ).
**قەد** : نێوانی دووکاریتە لە خانوودا :( خانووەکە *چوارقەدە* ).
**قەدەم** : جۆرێک ڕۆیشتنی ولاغە بەرزمیە.+
**قەرا** : حاند، ئاست :( گەیشتمە *قەرا* *ماڵی* ئێوە و *گەڕامەوە* ).+
**قەراقەرا** : یاری یەکی مندالانە.
**قەراقەراینێن** : قەراقەرا .
**قەروکوڵەزەر** : بەیتێکی کۆنی کوردی یە.
**قەرەتاژدین** : ناوی یەکێک لە قارەمانانی داستانی مەم و زینە. دەڵێن زۆر دەوڵەمەند بووە.
**قەرەوانە** : کتری.+
**قەف** : دەورمیەکی پشتێن :( *پشتێنەکەی شل بووە سێ قەف کەوتە سەر ڕانی* ). « فۆلکلۆر » +

**قەلاپەچن** : دەفری سەر لێو کراو ، دەفرێک پاش پڕبوون زیادی لە سەر دانراوە.
**قەلاجۆش** : قەلایی کردنی دەفری کون، گرتنی کونی دەفر بە قەلایی.
**قەلاشکەری** : قـلاشکـەری،داری ئەسـتـووری قـەلاشـراو بـو
**قەلاشکەری** : سووتاندن.
**قەڵتاغ شڕ** : یاری یەکی مندالانە، بە سێ کەس دەکرێ.
**قەڵتاغ شڕ** : کۆنەبەگ، ئاغای لێکەوتوو.
**قەللاش** : دیکتاتۆر، توندوتیژ، زاڵم.
دەسبڕ، گوێ بڕ، ئەوەی بە فێڵ و تەڵەکە پووڵ
**قەڵفەت** : لە خەڵک وەردەگرێ و نای داتەوە.×
**قەلنەڕێژ** : قەلافەت.
**قەلنەکێش** : تووتنی ئامادە بۆ قەلنە.
**قەلنەکێش** : ماوەی کێشانی قەلنەیەک.
**قەل وداڵ** : ئەو کەسەی خووی بە کێشانی قەلنەوە گرتوە.
ئەو باڵندانەی بەسەرکەلاکە حەیوانەوە دەگەڕێن.
**قەلەفسە** : جۆرێک گوڵی قرپۆک و ناشیرنە لە شاگوڵی کوردی دا .
**قەملاندن** : قەبلاندن، بەگۆترە ئەندازە گرتن.
**قەو** : قەوەت :( بە قەو لێی دە واتە توند و بە قەوەت لێی دە ).×
**قەیرە** : مریشک وکەوی گەورەتر لەیەک ساڵ.+
**قیرە** : زیرە، دەنگی بەرز لە تووڕەیی.+
**قیسکە** : بەرووڵەی خەیار و ترۆزی :( فیسکە خەیار ).+

# پیتی ک

**کابە :** گوڵەدان،گەنمەشامی.+

**کابەکەج بوون :** قیبلەوەرگەڕان.

**کابەکەج بوون :** بریتی یە لە کاری خراپ و قەباحەت :( چ بووە خۆ کابە کەج نەبووە ؟ ).

**کاپێچ :** بریتی یە لە زگ ئێشەیەک کە لە زۆرخواردنەوە پەیدا بێ.+

**کارپێ کردن :** وەکارخستن بۆ ئەوە بزانی کار دەکا یان نا؟ : ( *ئەم ماشێنەم کڕیوە کارم بۆ پێ بکە بزانە* چۆنە ).

**کارپێ کردن :** کارپێ سپاردن. بەکرێ گرتن.

**کارت :** کارد، کێرد، چەقۆ.

**کارتیغ :** کارتێخ.

**کاردروستایی :** خۆ ئامادە کردن :( خەریکی *کاردروستایی زەماوەندم*).

**کاردووپلاو :** جۆرەپلاوێکی برنجە کە کاردووی زەردکراوی لەگەڵ دەکەن.

**کارگەفسە** : جۆرێک کارگی ژەهراوی یە.

**کارووخ** : چیایەکی کوردستانە.

**کارەموو** : کاریلەی بزنی رەشان.

**کارەمەرەز** : کاریلەی بزنی مەرەز.

**کاسبکار** : کەسێکە بێکار دانانیشێ و هەرکارێک بۆی رێ بکەوێ دەی کا :( *کاسبکاری چاکە* ).+

**کاسەلەجیرانەتی**: ئەو چێشتەی بۆ ماڵی دراوسێی دەبەن، ناردنی چێشتەکە.

**کاشیکاری** : دانانی کاشی لە کاری خانوو دروست کردن دا .+

**کافر** : بریتی یە لە بێ ئینساف.+

**کافریاب** : بریتی یە لە بێ ئینساف ، بۆ دڵداران بەکار دەبرێ.

**کاکڵ** : بریتی یە لە پوختەی نێوەڕۆک :( *کاکڵی قسەکە ئەمەیە* ).+

**کاکۆڵ زێڕین** : کاکۆڵ زەرد، قژ زەرد، بریتی یە لە منداڵی نێرینەی جوان.

**کالانەوە** : وەشانەوە، لەگەل یەک هاتنەوە :( *ئەم دووانە لێک ناکاڵێنەوە* ).

**کاڵ ڕنن** : لێکردنەوەی میوە پێش ئەوەی بگا .

**کاڵ وکرچ** : بریتی یە لە مەبەست یان نووسینی لاواز و بێ نێوەڕۆک.+

**کاڵە** : پێتاو نیە، پێلاوی لە چەرمی خاوە، پێتاو پێنەی کاڵەیە.×

کاڵەبێن : بەن کاڵە، ئەو بەنەیە کاڵەی پێ قایم دەکەن. کە دەڵێن *کاڵە* بێنێک بەفر *باریوە*،مەبەستیان ئەوەیە بەفرەکە دەگاتە ئەو جێ یە کە بەن کاڵەکەی پێوەیە.×

کاڵەجۆش : دۆکلێوی تەواو نەکوڵیو.

کاڵەمستانە : پشکیلان نیە، یاری یەکە کە بە دە کڵاو دەکرێ و مازوویان تێ دا دەشاردرێتەوە. لە کاتێک دا پشکیلان بەچەند کەس دەکرێ کە دانیشتوون و قوتوویەک یان شتێکی دیکەیان تێ دەگێڕن و لای یەکێکیان بەجێی دێڵن ، دەبێ لای ئەوبەری یاری یەکە بی دۆزێتەوە .×

کاملْ : پێگەیشتووی گوێز و بادام.

کامەتا : وشەی پرسیارە لە شتێک کە دیار نیە، کوا، لەکوێ یە ؟ .×

کامەتانی : کامەتا.

کامەتە : کامەتا

کامەسە : کامەتا

کانالْ : هەڵکەندراو بۆ لێک دانەوەی ئاوی دوو دەریا : *( کانالی سوئێز )*.

کچەوەرە : بریتی یە لە قوماشی جوانی ژنانە.

کرگار : کاری بێ بایەخ :*( کاری نیە کرگاران دەکا )* «مەسەل».

کردە : بەرهەمی کار:*( هەرکردەی منە وبردەی زاڵم )*.+

کرشە : کڵۆشی کۆکراوەی لەسەر یەک دانراو، نەک هەر

کڵۆشێک بێ.×

کرم ساتان : جۆرێک قوماشی ژنانە بوو :( پشتێندی کرم ساتان *لەسەر سمتی خزیوە* ) « فۆلکلۆر »

کرمۆز : جۆرێک مێشی زۆر بەزەرەرە،نێوەراستی بەهاران لە هێندێک جێگا پەیدا دەبێ و ئاخری بەهاری پووش بەقوونە دەی خوا.

کرمەک : جۆرێک قوماشی ژنانە بوو.+

کڕووزانەوە : دەردی دڵی نابەجێ، باسی هەژاری کردن بێ ئەوەی هەژار بێ.+

کڕووزی : جۆرێک هەرمێ یە بۆ نێو ترشیات باشە.

کرێگرتە : بەکرێگیراو، « مزدور » .+

کڕێنک : کڕێن، رەقەن، زەویی رەقەن.

کزران : زەمینێکە کە ئاو هەڵدەمژێ و نابێ بە قوڕ، نەک هەڵنەمژێ.×

کفتوکۆ : ژانی برین :( بەو دەرمانە کفتوکۆی برینەکەم شکا ).+

کلاشە : هەڵگیرانی قوڕ بە پێڵاوەوە.×

کلاکلا : دەنگ دانی بارەبەر بۆ ئەوەی خۆی لە دارودەوەن لا بدا.

کلاشینکۆف : جۆرێک تفەنگی ڕیزی ڕووسی یە.

کلام : بەرنامەی رادیۆ، قسە، کەلام.

کلان : لە ڕێ دەرچوون.+

کڵاوبابردوو : کەسێک با کڵاوەکەی لێ ڕفاندوە یان خۆی داویەتە بەر با:( *وان بەسەر تووە کڵاو بابردوو*)

« هەژار »

**کلاوگەرگەڕی** : کلاوی لێواردار.

**کلاوە** : ئێسکی کەشکەژنو.+

**کڵدان** : ئاگرخۆش کردن: (سەرمایە *ئاگرمکە کڵ بدە*).+

**کلسی** : کلتور، کلدان.

**کلک ڕاوەشاندن**: بریتی یە لە خۆشحاڵی.

**کلک ڕاوەشاندن**: کلکەسووتە، مەرایی.

**کلکە** : بڕانەوەی زەوی یان بڕانەوەی ئاوی دەریا لە باریکی دا.+

**کلکە لەقە** : مەرایی :( بۆی کەوتە *کلکە لەقە* ، گوتی چی دەڵێن حەقە ) . « هەژار »

**کڵۆ** : بریتی یە لە شتی زۆر، ڕەقەمی زۆر :( بە *کڵۆ* پارەم دەست کەوت ).+

**کڵۆت** : ئێسکی سەرسمتی یەک سم.

**کڵووک** : گوڵووک ، گوڵی کێوی، گوڵی ورد.+

**کڵەو** : شەپۆلێک کە بە سەر بەردداا دەڕوا و بڵێند دەبێتەوە، نەک بەسەر پردداا.×

**کلێچە** : کلکی مەڕ، ئەو بەشنە کورت و باریکە لەسەر دووکی مەڕە.+

**کلێس** : وێران، وێران بوو.×

**کلێس بوون** : وێران بوون،هەر بۆ ماڵ و خانوو و شار و دێ بەکار دەبرێ .×

**کلێشە** : جەستە، لەشی بنیادەم.×

**کلێل** : قفل.+

**کلیله** : کلیل.

**گنر** : کەنگر.+

**کنەکردن** : بریتی یە لە مەمنوونی و مەجبووری :( ئەگەر ئەتۆ بە سەد تمەن کار دەکەی باشە، ئەگینا ئی وا هەیە بە هەشتا تمەن کنە دەکا ).+

**کۆبە** : قەراخێکە کە جیا لە قوماشی لیباسەکەبێ. کۆبەکەوا تیزماڵکێکە لە قەراخی کەوا دەگیرێ و لە قوماشی کەواکە نیە.×

**کۆپەک** : جۆرێک بەرووی زل و ئەستوورە کە بۆ خواردنی بنیادەم نابێ، نەک هەموو بەروویەک.×

**کووپە** : بریتی یە لە بنیادەمی گیلۆکە ( هالو ) ی فارسی.

**کۆپەین** : سەرانگوێلک.

**کۆپین** : کۆپۆن، پسوولەی جیرەی خواردەمەنی.

**کۆترە** : داری نێوان کۆڵەکە و کاریتە.×

**کۆترەگایە** : لە کۆترەشینێکە گەورەترە.×

**کۆترەگمگمە** : جۆرێ کۆترە.

**کۆترەگەورە** : جۆرە کۆترێکە لە هەموان گەورەترە.

**کۆتەڵ** : پەیکەرێکە بۆ مردووی ساز دەکەن و بە سواری ئەسپ دەی گێڕن، نەک ئەسپ.×

**کۆتەرە** : کوتەداری گەورەی بڕاوە، نەک قەدی داری بەپێوە.×

**کۆچبار** : کۆچ وبار.

**کۆچ وبار :** ئەو کاروانە کە ماڵی کۆچ کردووی پێ یە :( ئەو کۆچ و *بارە بۆ کوێ دەچێ ؟* ).+

**کۆچ وکۆچبار :** بارگە وبنە، کۆچ وبار.

**کوچی :** بانگ کردنە بۆ سەگ.+

**کۆچی سوور :** بریتی یە لە بە بووک چوونی کچ.

**کورتخەس :** هەموو سەرچنێکی تووتن نیە، بەوە دەگوترێ کە زۆری لێ بکرێتەوە.×

**کوردە :** سووکەڵە ناوی « کوردستان » ە ، ئەوکاتەی دەبێتە ناوی ژنان.

**کوردەناموسی:** غیرەتی کوردانە.

**کورکە :** دەنگی کەمی پەلەوەر.+

**کورکە :** دەنگی کەمی گریانی منداڵ :( *ئەمشەو باش بوو کورکەی نەکرد* ).+

**کوڕگەل :** کوڕەکان، لاوەکان :( *کوڕگەل* ، *کوڕی کوردی نەبەز* ، *مەرەستن کۆوەبن بەلەز* ). « هەژار »

**کۆڕەدار :** داری کۆڕپە، داری کورتەباڵا و پڕ لک و گەڵا.+

**کۆڕەو :** کۆز، کۆزیلکە، ئەڵقەی بنیادەمان :( *کۆڕەوی زکریمان بەست* ).

**کوڕەوەدار :** پۆلەدار.

**کوڕی ڕۆژ :** بەپیاوی ئازا دەگوترێ « *کوڕی ڕۆژی تەنگانە* » ، کوڕی ڕۆژ تەنیا بە هەلپەرست دەگوترێ.×

**کۆست کەوتن :** خۆشەویست مردن، نزیک ترین کەس مردن : ( *بووکی کۆست کەوتە ئەوەیە زاوای بمرێ* ).+

**کوشتار :** سەربڕینی حەیوان بۆ قەسابی.+

کوشته : ئاشق، ئەوگر :(*کوشتەی دووچاوی کاڵم*). «فۆلکلۆر»+

کوشتەری : جۆرێک رەندەیە بۆ تاشینی لاجامەی دەرگا و پەنجەرە و ... .

کوشمە : هەڵکورمان.+

کۆکەرەوە : ئەوەی شت خڕ دەکاتەوە.

کۆل : دارێکە بووزووی پێ لە قاڵب دەدەن تا ساف و لووس بێ.+

کوول : کەندی لێواری چۆم :(*کوولاوکوول دێ*).+

کۆڵ : کول، دژی تیژ، سواو.+

کۆڵچی : کۆڵکێش، کرێ کۆڵ، ئەوەی بە کرێ کۆڵ هەڵ دەگرێ.

کۆلدان : ساف و لووس کردنی بووزوو بە کۆل، لە کۆلدان.

کۆڵکردنەوە : لە کۆڵکردنەوە، لە یەخە کردنەوە.

کوڵندە : ناوی گۆرانی یەکی کوردی یە.

کۆڵەگروو : حاڵەتی پێش گریان، گریان هاتن.

کۆڵەگروو

لە ئەرکێ مان: گریان بەری قورگ گرتن.

کوڵهێنان : کوڵاندن، وەکوڵ هێنان.

کوڵی : دەست نەقوستانی.

کولێرەشەکرە : جۆرێ کولێرەیە شەکر و شیر و ڕۆن لەگەڵ هەویرەکەی دەکرێ.

کوڵی گریان : گریان هاتن، مەحزوون بوون.

کونجری : گیایەکی دڕکاوی یە.
کوٙنجی : مریشکی خاڵدار ( ڕەش و سپی ).+
کوٙندڕە : گیایەکی دڕکاوی یە.
کون دەجەرگ : جاڕز، وەڕەز:( هێندەی گوت کون دەجەرگی کردم ).
کوندەمیز : بریتی یە لە منداڵێک کە شەوانە لە خۆی دەمیزێ.
کوێخایەتی : کاری کوێخا.
کوێخایەتی : ریش سپی گەری.
کوێر : گوێزێک کە کاکڵەکەی زۆر بە زەحمەت دەردێ.+
کەپرسەوز : بریتی یە لە کەسێک کە زووزوو مەنزڵ دەگۆڕێ یان کار دەگۆڕێ .
کەچکەقوڵێ : کەوچکی کلک شکاو :( پەپوو، شیرمکە هەڵچوو، کەچکە قوڵێ نەبوو ). « فۆلکلۆر »
کەچەڵی ئاختفی: کەچەڵێک کە سەرانسەری مووی سەری وەریبێ و لەپکەی پێوەبێ بە جۆرێک کە خەڵک بێزی لێ بکەن.
کەچەڵی تەپ تەپی : کەچەڵێک کە تەنیا مووی تەپڵە سەری وەریوە.
کەراوکەرکەوتن : بریتی یە لەوە کە دووکەس بە شێوەی نامەعقوول بکەونە کێشە و هەرا و هیچیان تەسلیم نەبن.
کەربازاری : هەرا و زەنای دوور لە ئەدەب.
کەرتوێنە : هەورازی سەخت.

**کەرپیاو** : بریتی یە لە پیاوی گێلۆکە.
**کەرد** : بەری درووێنە.
**کەرکەرۆکە** : دارێکە بەسەر هەیوانی مزگەوتانی رادێلن بۆ لەسەر دانیشتنی.
**کەرمسووری**
**مل درێژ** : جۆرێ گەمەی مندالانە
**کەرمسۆ** : بێ گوێ، لاسار.
**کەژ** : وەختی کێلان بۆ زەوی :( کەژی خۆشە ، کەژی هاتۆتەوە ).+
**کەژ** : چاخ، وەخت :( *با* بچینە *مازوان* کەژیەتی ).+
**کەژ** : فەسلی سال :( کەژی *هاوینێ* هەمووی نۆبەتی *دای گرتم* ).+
**کەس تێ نەپیاو:** جنێوێکی ژنانەیە بە قەیرە کچێکی دەلێن کە زۆر مابێتەوە و کەس خوازبێنیی نەکردبێ.
**کەس نەزان** : ناوی دارێکە.
**کەس نەکردە** : کەس نەکردوو، بریتی یە لە کاری زۆرناشیرین.
**کەشکەفەریک** : جۆرێ کەشکی کەم خوێ یە کە رەشکە و کاخلێی لەگەڵ دەکەن و پێش ئەوەی بە تەواوی وشک بێ دەی برژێنن و دەی خۆن.
**کەشکەک** : چێشتی گۆشتە کە بە گەنمە کوتاوەوە لێ بنرێ.×
**کەف دەردان** : دەرکەوتنی کەف لە قەدی گوێنی و چوالە و کۆخ و قەیسی پێش ئەوەی بمەیێ و ببێتە جاوی.

**کەف هەڵدان** کەف پەیدابوون لە سەر شتێک کە خەریکە دێتە کوڵ.

**کەف هەڵخڕاندن:** کەف لە دەم هاتنی نەخۆش، بە تایبەتی لە کاتی سەرەمەرگ دا.

**کەڵ :** داری دارەڕای خانوو کە باری زەقی لـــە حەوا بێ.+

**کەلارە :** جۆرێک سەر و شەدەی ژنانە.+

**کەڵلاش :** قەڵلاشیش دەگوترێ، بە فێڵ و دەسبڕ.

**کەڵلە :** دیوی خڕی سەرسووچی خانوو.+

**کەڵوو :** ناوچەیەکە لە کوردستان.+

**کەڵوت :** جوانەگا، گای نەخەساو.+

**کەڵەبابە :** تـووتـنـێک کـە بـاش شـین بـووە و لــە دێـراو هاتۆتە دەر :( *تووتنەکەم کەڵەبابە بووە* ).+

**کەڵەشاخ :** شاخی حەیوان کە دروێنەوان ڕۆنی تێدا هەڵ دەگرن.+

**کەڵەکچی :** فێڵباز، بەدەمەق.+

**کەڵەمەکێش :** گای سەرڕەق، گایەک بە ئاسانی جووت نەکا.+

**کەم دۆ :** ماڵی ئەستێور.×

**کەم قنیات :** بێ سەبر، بێ حەوسەڵە.×

**کەندوکۆژ :** لێکۆڵینەوە و یەکالاکردن.

**کەندوکۆسپ :** گیروگرفت،هەورازونشێو.

**کەندولەند :** گیروگرفت،هەورازونشێو.

**کەندەوە وکۆژەوە:** کەندوکۆژ، لێکۆڵینەوەی زۆر.

**کەوباز :** ئەو کەسەیە کەوان ڕادەگرێ بۆ شەڕەکەو، نەک

ئەوەی ڕاویان پێ دەکا.×

کەوبوار : ئەو کەوانە کە سەرە بەهاران لە گەرمێنەوە کۆچ دەکەن بۆ کوێستان.×

کەوبەدار : مانگی ئاخری بەهارە کە کەوی ڕاوی بە دارەوە دەنرێ، ئەگینا کەو بۆ خۆی قەت لە دار نانیشێ.×

کەوپەڕ : نێوان دوو کێوە کە مەوداکەیان لێک دوورە و کەو بە یەک باڵ نای بڕێ.×

کەوتن : بریتی یە لە کەسادی بازار :( *ماڵات کەوتوە، نافرۆشرێ* ).+

کەوتنەسەر : سەردەوونان، ڕاونان، ڕەپێ نان.+

کەورگ : خڕکە بەرد، بەردی گەورە :( *کەورگێکی پێدا دا لاقێکی شکاند* ).+

کەوڵەسپێ : بریتی یە لە ئینسانی دژوێن و ئەسپێون.

کەوپایی : نزمایی لە چیا و بەندەن، دژی قوتکە.

# پیتی گ

**گارانی** : گوێرپار، پارین، گوێلکی دووساڵە.

**گاڕانی** : بریتی یە لە گێل و بێ شعوور.

**گازکردن** : بانگ کردن.+

**گاگێرە** : چینێکی دووقاتی دەوری کلاشی کوردی یە بۆ جوان و قایم بوون.+

**گاگێڕەوە** : جۆرێک پەرژینی دەوری خەرمان بۆ ئەوەی کاتی گێرە ولاغەکان نەچنە دەر.

**گاڵوبوغر** : گاڵوبوغ، دەنگی قسەکردنی منداڵی ساوا.

**گالیس** : بریتی یە لە بەتاڵ کردنی دەفری خواردن : ( *قاپەکەی گالیس کرد* ).

**گان گانۆکە** : خۆبەیەکەوەنانی منداڵان، لاسایی گان کردنەوە.×

**گجە** : گرژە، بەرێکی دارمازوویە.+

**گرژاڵی** : ڕەنگێکی تێکەڵاو لە سوور و ڕەش.

**گرگر** : بەرداش لەتەپاڵە یان تەختە داری چووک چووک بۆ پاک کردنی چەڵتووک.+

گرمپێچان : گرگرتنی تەندوور بە توندی.
گریمانە : لیری لەش :( *هەموو لەشی بۆتە گریمانە* ).+
گریوانکە : گروانکە، ٤١٠ ( چوارسەد و دە ) گەرم.
گزرمیی : مازووی شین کە تازە خەریکە سپی ببێ.
گزرمیی : عەمبارەمازووی سپی و شینی تێکەڵاو.
گلاوکردن : دم لێ دانی سەگ لە قاپ و قاچاغ و هەر شتێ.×
گلاوکردنەوە : شوتنەوەی گلاوکراو بە قوڕاوێک و شەش ئاوی ڕوون.
گلواز : ئەڵقەی بە خلەخل بە داری بێشکەوە.+
گلواز : جۆرێک گوێزی زۆر درشت و ئازایە.+
گلەشۆک : گڵێکی سپی یە لە دۆشاو دەکرێ بۆ ئەوەی شیرین بێ.
گنخاندن : تەنەخی کردن، وەدوا خستن.
گووپنە : مریشکێک کە سەری زلە و دەوری چاوانی گۆشتنە.+
گۆدەگۆدە : ڕۆیشتنی بە لارەلار، ڕۆیشتنی ناڕێک.
گورد : ڕیزە هەودا بەنێکی تایبەتی یە کە لە تەون و جۆلایی دا داوە ڕایەڵەکانی بە نێودا دەڕۆن. بە دارەکەی دەگوترێ « *دارگورد* » .×
گورزی کوێری : گورزەکوێرە، جۆرێک یاری یە کە چاوی یەکێک دەبەستن و گورزی دەدەنە دەست.
گورگەلوور : دەنگی لووراندنی چەند گورگ بەسەر یەکەوە.+
گورگەمێش : بریتی یە لە کەسێک کە چاو دەگێڕێ بۆ ئەوەی

شتێک هەڵ نێ و دوایە بی دزێ.+

گورەتا : تین وتا، توانا، هێز.+

گۆرێ : گۆری، گۆرەوی.

گۆریس : گوریس.

گوزەر : شوێنی کۆبوونەوەی کاسبکاران :( گوزەری *کاسبکاران ، گوزەری بەقالان* ).+

گووش : پەتی بادراو، پەتی ئەستوور.+

گۆشت برژێن : ئامرازی گۆشت برژاندن.+

گۆشتەوەزوون : گۆشتەزوون.

گۆشتی سەرچاپەر : بریتی یە لە شتێک کە بێ عەیبی یەکەی تەزمین ناکرێ :( بە گۆشتی سەر چەپەرێت پێ دەفرۆشم ).×

گووگە : گورگ، بۆ منداڵانی دەڵێن :( مەچۆ دەرێ گورگە دەت *خوا* ).

گوڵ : جێگەی دانی دەغڵ ودان :( گوڵە گەنم ، گوڵەجۆ ).+

گولان : ناوە بۆ ژنان.+

گوڵ ئاودان : ئاوداشتنی گولان.

گوڵپەر : پەرینی گەنم، زیاد لە پێویست گەیشتنی دەغڵ و دان .×

گوڵ دان : گوڵ دەرکردنی گەنم وجۆ.+

گولستان : ناوە بۆ ژنان.+

گوڵووک : گڵووک، کڵووک، گوڵی وردی کێوی.

**گوڵ وەدەم** : گوڵ بەدەم، خەیاری ساوا و شلک.

**گوڵەبەرانە** : گوڵێکی کێوی یە، بۆنخۆش و درشت تر لە گوڵەبەڕۆنە.

**گوڵەداسوو** : جۆرێ زیبکەی سەرتیژە لە زمانی ڕەشە وڵاغ دێ.

**گوڵەدان** : گەنمەشامی، گوڵەکابە، گوڵەپێغەمبەرە.

**گولیلک** : گوڵووک، کڵووک.

**گۆم** : داری دارەڕایە کە «مقعّر» ەکەی لە لای سەرەوە بێ.+

**گۆماو** : قووڵکەی چووکی پڕ لە ئاو.+

**گووەشک** : پیسایی مشک.

**گوومێش** : پیسایی مێش وەگەز، پیسایی مێشە ڕەشکە.

**گوناح** : هەژار، بەستەزمان.+

**گۆنیا** : وەک یەک بوونی درێژایی نێوان هەردوو سووچی وەتاغ :( ئەم وەتاغە گۆنیا نیە ).

**گوێ پرووچەکێنە**: کێ بەرکێ لە ڕفاندن دا.

**گوێ تەلاش** : بزنی گوێ پان.

**گوێ تەندوور** : بریتی یە لە قوژبنی ماڵ :( *لەپێ کەوتوە کەوتۆتە گوێ تەندووران* ).

**گوێ دان** : دووپەلایی کۆڵەکە کە کاریتەی دەخرێتە سەر.+

**گوێزەوان** : ئەوکەسەی پاسەوانی لە دارگوێزان دەکا بۆ ئەوەی خەڵکی دیکە بەرەکەیان نەڕنێ.+

**گوێ لەمست** : بریتی یە لە کەسێک کە خاوەنی بیروباوەڕی خۆی نیە و بە چاوبەستراوی خۆی تەسلیمی

یەکێکی دیکە دەکا.+

**گوێنی یە**
**سپیلکە** : جۆرێک گوێنی یە کە زۆر گەورە دەبێ و کەتیرەشی کەمە، زیاتر بو ئاوردوو کەڵکی لێ وەر دەگیرێ.

**گوێ هەڵپڕوو-**
**چەکێن** : گوێ پرووچەکێنە.

**گوێ هەڵخستن** : بە ئەنقەست گوێ راگرتن و قسە نەکردن بۆ ئەوەی شتێک هەست پێ بکەی.

**گەداسیفەت** : سەرسواڵکەر، خوازەرۆک.

**گەردن بەخاڵ** : خاڵ لەمل، مل بەخاڵ.

**گەردەگەردە** : ئاهەنگێکی گۆرانیی کوردی یە.

**گەرگەڕی** : جۆرێک کلاوە ( شاپۆی لبەدار ).+

**گرمکە کردن** : پاڵ وێدانی چەند کەس لە نێو جێ دا بۆ ئەوەی گەرمیان بێتەوە.

**گەرمەلان** : کەروێشک کە تازە لەلان دەرپەڕیوە.

**گەروو** : بستوونیە، بەڵکوو باریکایی نێوان دوو تەپۆڵکەیە کە دەکەوێتە سەر چیا و ئەم دیو ئەو دیوی پێدا دەکرێ.×

**گەرووپاک -**
**کردنەوە** : کۆخین وبەڵغەم دەردان لە گەروو بۆ ئەوەی خۆی بۆ قسەکردن یان گۆرانی گوتن ئامادە بکا.

**گەروولە** : گەرووی ئاش، ئەو دوێڵە کە دانە گەنمی پێدا دەچێتە نێو بەرداش.

گەزتن : ئازاردانی کەم :( ئاگرەکە گەزتویە، بەلام نەی سووتاندوە ).+

گەسکەحۆلکە : جۆرە گەسکێکە گیایەکەی وەک گەلای گەنمەشامی دەچێ و تۆوەکەی لە هەرزنەگەورە دەکا.

گەسکەکێویلە : چەند جۆرە گیای کێوی یە کە بە کەلکی گەسک دێن.

گەش بین : ئەوەی ئایندە روون دەبینێ، خۆشبین، دژی رەش بین.

گەفاندن : مراندنی سەگ.+

گەگر : تەنیا تایبەتی یەکسم نیە بۆ گاجووتیش دەگوترێ.×

گەڵ : قۆری یە گەلای بۆ خواردنی ئاژەڵ بڕراو.+

گلاڵبزگەنە : گیایەکی بۆن ناخۆشە لەسەرانگویلکان دەڕوێ.

گەلاچنارە : گیایەکی بالابەرزە گەلاکانی وەک گەلا چنارن.

گەلاکردن : گەڵ کردن، بڕینی لکەداری بە گەلا بۆ خواردنی ئاژەڵ.+

گەلاکوت : کوتانی دارگوێز پێش گەیشتنی کە وێڕای گوێزەکان گەلاکانیش دەوەرن.+

گەلاگووش : دەست هێنان بە لکەکانی دارمازوودا بۆ ئەوەی هەموو مازووەکان بدۆزینەوە.

گەلاوێژنەنگوتن : رۆژی نیوەی هاوین هاتن.

گەڵباخی : عەشیرەتێکی کوردن.

گەڵبڕ : پاڵەی گەلابڕین. ئەو کەسەی لکەداری بە گەلا

بۆ ئالفی ئاژەڵ دەبڕێ.

**گەڵبڕ** : بریتی یە لە ژنی زەبەلاح و نێرەکی :( *لای بە بابە ئەو گەڵبرە بەکەڵک نایە* ).

**گەڵبڕین** : کاری گەڵبڕ :( *گەڵبڕین پیاوی بەتاقەتی دەوێ* ).

**گەڵدان** : گەڵای وشک بە ئاژەڵدان لە زستان دا : ( *بزنەگەلەکەت گەڵ داوە ؟* ).

**گەڵک** : وشکەڵەداری بەگەڵاوە :( *گەڵکێک وەبینە ئاگری پێ بکەینەوە* ).

**گەڵۆر** : بێکارە و بەرەڵڵا.+

**گەڵوان** . گڵوان، گزگل، بەریکی دارمازوویە.

**گەلەڕاوژە** : گەرەلاوژە، بەنۆرە گۆرانی گوتنی هەموو دانیشتووانی کۆڕ.

**گەلەکۆمەکی** : هاوکاری کردنی زۆران لە دژی یەکێک : ( *گەلەکومەکی یان لێ کردوە* ).×

**گەناندن** : پیس کردنی هێلکە و دەرنەهێنانی لە لایەن مریشکەکورکەوە.+

**گەندەنێ** : گەنمێک کە بە وشکەوەر داچێندرابێ و بارانێکی کەمی لێ بباریْ و چەکەرەکەی وشک بێ.×

**گەندەنیا** : گەندەنێ.

**گەنم دەرەو** : بریتی یە لە هەوەلی هاوین.+

**گەنە** : جانەوەرێکی پیسە کە خوێنی ئاژەڵ دەمژێ و کزی دەکا.+

**گەورە پیاو** : پیاوی ناودار،پیاوی هەڵکەوتوو.

گەوزاندن : پێ پەست کردن، شێواندن.+

گەوهەرفرۆش : زێڕنگەر، کەسێ کە جەواهیرات دەفرۆشێ.

گەوهەری : گەوهەرفرۆش.

گیابرژیوە : تێکڕای ئەو گیا بەهاری یانە کە بە زەردکراوی وسوورەوەکراوی دەخورێن.

گیادۆکلێو : ئەو گیایانە کە لەگەل چێشتی دۆ و گەنم یان برنج و جۆ دەکرێن و دۆکلێویان لێ ساز دەکرێ.

گیازەرتک : گیایەکە بەنی پێ رەنگ دەکەن و رەنگی زەردی لێ پەیدا دەبێ.

گیاکرمە : گیایەکە وشکی دەکەن و بە برینی ئاژەلیەوە دەکەن. ئەگەر کرمی هەبێ کرمەکەی دەکوژێ.

گیانەلّلا : دەمی ئاویلکەدان، دەمی گیان دەرچوون.

گێرەوکێشە : گێرەوکێشەکێشەکێش.

گێرەشێوێن : گایەکە کە لە گاگێرەدا بەند نابێ و دەردەپەڕێ بۆ دەری خەرمان.+

گێژەڕاو : حاڵەتێکە تووشی رێوی دەبێ کە لە خۆوە دەسووڕێتەوە و ئاگای لە خۆی نیە.+

گێوژەقورە : جۆرێک گێوژە کە بەری زۆر دەگرێ و ئەگەر باش بگا رەنگی رەش دەبێ.

# پیتی ل

**لابان** : بەشێکی بانی خانوو :( *ئەم لابانەم مــــاوە بێ ماڵم* ).+

**لاپێ** : بەفرێک کە سەرەکەی بەستوویە، کاتی بەسەردا ڕۆیشتن نیوەی دەشکێ و نیوەی ناشکێ.+

**لاتر** : هــەڵەنــگــوتــن، بــەلاداهــاتــن :( *لاتــرێکــی بــرد نووپەراسووی شکا* ).

**لاتربردن** : هەڵەنگوتن، بەلاداهاتن.

**لاتسیاو لاتسیاو**: لاجەلاج، لارەلار.

**لاجەلاج** : لارەلار، لاژەلاژ.

**لاچاو** : لاڕوومەت.+

**لاخوراو** : میوەیەک کە لایەکی دەعبا خواردوویە.+

**لادەست** : ئـەوەی لـە تەنیشـت کایـەکەران دانیشتـوە : ( *لادەست زەینی ڕوونە* ).+

**لاڕەشە** : نەخۆشی یەکە هەم بنیادەم تووشی دەبێ هەم ئاژەڵ.×

**لاڕێ** : «بیراهە» ی فارسی :( *بەلاڕێ دا ڕۆیشت* ).+

**لاس :** جۆرێک داری سنجوویە وەرکیشی هەیە، بەلام بەرناگرێ. لە راستی دا نێرەی دارسنجوویە.×

**لاس و خەزاڵ :** بەیتێکی فۆلکلۆری کوردی یە.

**لاق و لەتەر :** قاچ وقول، لای خوارەوەی لاق :( *لاق ولەتەری پیس بووە* ).

**لاق ولەوەر :** لاق ولەتەر.

**لاقەپرغە :** لاقەبرغە، خاڵیگە.

**لاڵەنگی :** جۆرێک کولیچەی ئاردوشەکرە.+

**لالەوەڕ :** ئاژەڵێکەکە بۆزۆرزۆرکاردەکاوخراپ دەلەوەڕێ.×

**لامل :** سەرکێش، نەگونجاو، نافەرمان.×

**لانکەیی :** چاڵ یان هەر شتێکی « مستطیل » کە بە دەست دروست دەکرێ.×

**لانوا :** بەشێکی چادر کە بۆ حەوانەوەی یەک دوو کەس دەبێ.

**لانواڵ :** نواڵی کوێستان.

**لاوونیو :** کەش و توش، ( مورّب ) ، سووچاوسووچ.

**لرفاندن :** خێراخواردن:( *مێندی بڵێی یەک و دوو مەلی لرفاند* ).

**لزگە :** بەنک :( *لزگە زەنگیانە* ).

**لغاوبۆشل کردن:** لغاوبەردانەوە بۆ ئەوەی ئەسپ بەکەیفی خۆی بڕوا.+

**لغاوبەردانەوە :** لغاو بۆ شل کردن.

**لفکە :** سۆرانی، فەقیانە.+

**لفکە :** کلکەی بوخچە و پێ پێچە و داوێنی کراسی

ژنانه و ... .+

**لمب** : لم، رەلم، رەمل.

**لمب** : میوەی زۆرگەییو، دژی تورت.

**لووت ڕاسان** : بەربوونی خوێنی کەپۆ.

**لووتکەڵەشاخ** : کەسێک کە کونی کەپۆی زۆر فرەوان بێ.

**لووت هاتن** : ئاوی کەپۆ هاتنەخوار :( *منداڵەکە لووتی هاتوە بۆی پاک بکەرەوە* ).

**لۆچ تێ کەوتن** : پەیدابوونی گنج ولۆنج :( *لۆچی لەدەم وچاو کەوتوە* ).

**لۆدە** : گیای هەڕەمە، گیاجاڕ، موقابیلی گیامێرگ.+

**لۆری لۆری** : ئارام ئارام :( *بە لۆری لۆری هاتەوە سەر ... بۆری* ). « مەسەل »

**لووس بوون** : سوان :( *ددانی لووس بوون هیچ نابڕن* ).+

**لۆسک** : قەدی دار.

**لۆگەن** : لۆسوورە، لۆگەنە.

**لوولووەهەڵکردن** : بەنی تێوەدان لەسەر لوولکی جۆلایی هەڵکردن.

**لە بەریەک ڕەوینەوە** : گوشادبوونەوەی قەفی گۆچان و کەوان، بریتی لە قەڵەوبوونی زۆر خێرا.

**لەبیرخۆبردنەوە** : پشت گوێ خستن:(*قسەکەی لەبیرخۆی بردەوە*).

**لەپاش** : دواکەوتوو، بەجێ ماو :( *کاسبی یەکەمان زۆر لەپاشە* ).+

**لەپاش** : باری وڵاخ کە لە نێوەڕاستی پشتی نەبێ و زیاتر بۆ لای پاشەوە چووبێ.+

لەپکە : توێی هەویری وشکەوە بوو بەسەر نانەوە.+
لەپکە : کڵۆ گەزۆی گەورەگەورە بەسەر گەڵای دارەوە.+
لەپێش : کاری زووکراو :( *کارمان لە پێشە* ).+
لەپێش : باری وڵاخ کە زیاتر بەلای سەری وڵاخەکەوە چووبێ.+
لەتان وپۆکەوتن: لە کەڵک کەوتن، زوو پیر بوون.
لەدوا : لە پاش بە هەموو ماناکانیەوە.
لەدووچوون : چوونە لای کەسێک بۆ لەگەڵ خۆ هێنان.
لەدووهاتن : هاتنە لای کەسێک بۆ لەگەڵ خۆ بردن.
لەدەم ودووکەوتن: زمان شکان لە بەر نەخۆشی یان پیری.
لەڕوودان : بەخۆدا شکاندنەوە، قسە بەسەر چاودا دانەوە.
لەڕێ ترازان : لە ڕێگە لادان.
لەڕێ هەتلەبوون: ڕێگا ون کردن.
لەزاخ نان : بۆ دەست دەگوترێ :( *دەست لە زاخ نان* واتە خلەتاندن و دەست برین ).
لەزاردەرچوون : قسە لە دەم دەرچوون، لە زار ترازان.
لەزک چوونەوە : لە زاووزێ وەستان.
لەسەرگرێو : ئەنجام دانی کارێک وگرێو لەسەرئاکامەکەی.×
لەسەریەک : بە تێکڕا.+
لەغاویەدەم
دادانەوە : دەمکوت کردن، بێ دەنگ کردن.
لەق : جووتە :( *ئەم هێسترە لەقان داوێ*)، لەقەش دەگوترێ.+
لەقاودان : لە هەڵلادان،عەیبی یەکێک لە لای خەڵک گوتن.

**لەگاچوونەوە** : وشک بوونەوە و لەکەش چوونەوەی زەوی پاش ئاو داشتن.

**لەگوین** : وێ چوو، شک بۆچوو، مومکین :( *لەگوینە باران بباریٚ* ).

**لەگوین** : وەک، وێنە :( *پیاوی لەگوین تۆ کەم پەیدادەبیٚ*).

**لەلەوەرخستن** : ئازاری زۆرپیٚ گەیاندن. بەجۆرێک کە لەوەڕی پیٚ نەخوریٚ.

**لەلەوەرکەوتن** : نەخۆش بوونی ئاژەڵ بەڕادەیەک کە لە خواردن بکەویٚ. (بەمەجاز بۆ بنیادەمیش بەکار دەبریٚ).

**لەمردن** : نەخۆشی نزیک بە مردن .( *دایکم نەخۆشە، لە مردنە* ).

**لەنجە** : ناوی گۆرانی یەکی کوردی یە.+

**لەنجەولار** : ڕۆیشتن بە عیشوە و ناز :( *بەلەنجەولار هاتەوە یارم لە ڕێگای کانی* ). « فۆلکلۆر »

**لەنگ ولۆر** : شەق وشڕ.

**لەمێکەوە** : لەپڕڕا، لەنەکاو.

**لەیاز** : لایەن، ئاوبردەڵە، ئاوماڵک.

**لەیل ومەجروەم**: لەیلیٚ و مەجنوونی داستانی کەونارا .+

**لەیم** : جومگە، بەند ( مفصل ).+

**لیٚ بەربوون** : لەدەست بەرهەڵبوون :( *ئەسپەکەی لیٚ بەربوو* ).

**لیٚ بەربوون** : با لیٚ دەرچوون، با لیٚ بوونەوە.

**لیٚ پڕبوون** : پیٚ پڕ بوون :( *جەهەننەمت لیٚ پڕ بیٚ* واتە جەهەننەمت پیٚ پڕ بیٚ و جیٚی کەسی دیکەی لیٚ نەبێتەوە ).+

**لێ تێکلاوبوون:** دووشت لێ تێکەڵ بوون، دوو حیساب لێ تێکەڵ بوون، تێکەڵ بوونی دوو پارچە میگەل.

**لێ تێکەلاوبوون:** لێ‌تێکەلاوبوون.

**لێ خواردن :** خواردن لە چێشتی سەر ئاگر :( *لێی بخۆ بزانە تام و خوێی چۆنە ؟* ).+

**لێ داهێنان :** مەتەڵۆکە لێ پرسینەوە.

**لێ داهێنان :** دەورەدان بۆ حەز لێ کردن.

**لێ دەرکردن :** وەدەرنانی ئاژەڵ لە زەرعات :( *ئەو بزنە لەو بنیستانە دەرکە* ).+

**لێ دەرکردن :** تەکاندنەوەی سەگی دڕ لە میوان و نەناس : ( *ئەو سەگە لە میوانەکان دەرکە* ).+

**لێرووکانە :** ئالێرە.

**لێرەکانە :** لێرووکانە.

**لێس :** زمان بەشتێک دا هێن:( *تاوەلێس،کاسەلێس*).+

**لۆلۆ :** مەقامێکی کۆنی کوردی یە.+

**لێوجوین :** گاز لە لێوی خۆ گرتن لەبەر فکروغەم وخەیاڵ.

**لێوکردن :** لێو هەڵقرچاندنی ساوا پێش گریان.

**لیوە :** ڕەمل، ڕەڵم.+

**لێ وەستانەوە :** تەماشای برین، تەماشای نەخۆش.+

**لێوهەڵقرچاندن :** لێو تێک نان و ڕوو گرژ کردن، لە بەربێز یان لەبەر بێزاری.

**لێ هەستان :** هەوەس بزووتنی پیاوبەدیتنی ژنێک :( *لای بە لێی هەڵ ناستێ* ).+

# پیتی م

**ماته** : هەڵمات، پووڵەوردە یان مازوویەک کە هەرکام لە یاری کەرانی کەلایێن دای دەکەن.+

**مارپێچ** : هەر شتێکی خواروخێچ.+

**مارمژ** : بە سیگارکێشێک دەگوترێ کە هەموو دووکەڵەکە قووت دەدا .+

**مارۆ** : جۆرێک قوماشی بەری ژنان بوو.+

**مازووبەردان** : بە رۆژی نێوەڕاستی هاوین دەگوترێ کە لەو رۆژەدا مازووچنین ئازادە.

**ماشتن** : بریتی یە لە تەواو کردنی خواردنی سەرسفرە: ( *سفرەکەی ماشت* ).+

**ماشتنەوە** : ماڵینەوە، خەلاس کردنی خواردن لەسەر سفرە.

**ماقۆر** : برینی زۆرگەورە لە لەش.+

**ماکاو** : ئەو بەشە لە ئاوی جۆگەی گەورەیە کە بەر دەدرێتەوە سەر زەوی یەک. بە شوێنەکەشی دەگوترێ.×

**ماڵ کردن** : بریتی یە لە مردن.+

مالۆچکە : کایەیەکی منداڵانە کە شوورەیەک بە دەوری خۆیان دا دەکێشن و لە بەرد و دار سەماوەر و قوری فەرز دەکەن.+

مالووسک : مالووسکەی خەرمان.

مالوێچە : مالۆچە.

ماڵیاوا : بۆ خەبەردان لە سەرکەوتن لە کارێک دا دەگوترێ، بۆ وێنە ئەگەر بە چەند کەس لە شتێک دەگەڕێن ئەوەی دەیبینێتەوە هاوار دەکا « *ماڵیاوا* ».+

مانگی : ساڵی مانگی، ساڵی قەمەری، ئەو ساڵەی بە « محرّم » دەست پێ دەکا و بە « ذی الحجه » تەواو دەبێ.

مجێوری : کەسب وکاری مجێور، کاری خزمەتکاری مزگەوت.+

مجێوری : ئەو هەقە کە مجێور وەری دەگرێ :( بە نانی مجێوری گەورە بووە ).+

مچوون : هەموو، تێکڕا :( *خرومچوونیان ڕۆیشتوون* ).+

محەسڵ : قاسید، « مأمور » .

محەندەک : ئەسپی ڕەسەن.

مرار : داخ، ئەزرەت :( *مراری لە دڵم* ).+

مران : دارێکی توول درێژ و پەلک خشتە لە دەم و ڕووباران دەڕوێ.+

مردارەمانگ : نێوان بەهار و هاوینە ، ئەک ( مردادماه ).x

مردە : رووشاڵی بەری هەمبانە.+

مردەوەژی : پشکنینەوە و دووبارە ڕستنەوەی بەڕەکۆن و شتی وا.

مڕوو : برش، کڕوو.+

مریشکەقوڵە : ناوی چیرۆکێکی منداڵانە.

مزەورە : چێشتێکە لە ماش وپرپرە و ئاوە تەماتە یان سماق دروست دەکرێ.×

مژدی : مەگیرانی، ( ویار ) ی فارسی.

مس : بزنێکە کە ڕەنگی گوێی سوور و ڕەش بێ، ئەوەی گوێی خاڵ خاڵە پۆشە.×

مست لەچاودان: کاری کوتوپڕ.

مستە : سووکەڵەناوی مستەفایە.+

مسکێ : ناوە بۆ ژنان.

مقاوی : مقاو، نەخۆشی یەکی ئاژەڵە.

مکوڕ : سوور لەسەر نەزەر ، ( مُصرّ ) .×

مل : باریکایی پێش سەر لە هەر شتێک :( *ملە کوولەکە* ).+

مل بادان : سەربادان،سەرهەڵسووڕاندن.+

منداڵ بازاڕی : کاری منداڵانە.

منداڵ وەژن : بەمانای گەورە وبچووک یان ورد و درشتە، نەک منداڵ و کاڵ.×

منجەمنج : قسەجوین، قسە بەڕاشکاوی نەگوتن :( *ئەم منجە منجەی ناوێ ، ڕاست و ڕەوان بڵێ چیت دەوێ* ).×

منگاندن : لە بن لێوەوە قسە کردن.×

موو : بزنی رەشانک، دژی مەرەز.+
موکوڕ : سوور لەسەر بیروڕا، ( مُصرّ ).×
مەترەق : داردەستی ئەستوور.+
مەترەق : بریتی یە لە ئەندامی شەرمی پیاو.+
مەترەلێوز : مەترەلۆز.
مەجبووراوا : گەرەکی فەقیرنشین،خانووی بە تەنەکە وتەلیس، ( حلبی آباد ) ی فارسی.
مەجوعمە : سینی.
مەجێ : سووکەڵەناوی مەنیج :( خەجێ ومەجێ واتە خەجیج و مەنیج ).
مەحبووس : یاری یەکە بە تەختەنەرد دەکرێ.
مەختە : پووڵێکە کە خاوەن ملک جیا لە بەهرەی ملکانە لەسەر مووچەی دادەنێ.+
مەدار : گوزەران :( *مانگی بە مەزارتمەن مەدار ناکەم* ).+
مەدار : بە تەبایی حاوانەوە :( *ژنەکەی لەگەلی مەدار ناکا* ).+
مەڕ : مێگەلی مەڕ و بزن.+
مەرزینگان : ناوە بۆ ژنان.
مەرس : وشەیەکە لە کاتی جووت کردن دا بۆ گاجووتی دەڵێن مانای ئەوەیە داگەڕێ بۆ لای بەرەوە.×
مەرگی موفاجا: مەرگی لەنەکاو، دڵ ڕاوەستان، (سکتەی قلبی).
مەست کردن : سەرخۆش کردنی کەسێکی غەیری خۆت، ئارەق دەرخوارد دان.+

مەستوورە : ناوە بۆ ژنان.+

مەشکەدڕە : کوللەیەکی شینی زۆر گەورەیە.×

مەکات : میقدارێک گەنم کە خاوەن ملْک جیا لە دەوودوو لە جووتیاری دەستاند.×

مەمکۆڵە : مەمک مژە.+

مەمکە : جێگای نەوت لێ دەرچوونی پەرامێز و چراتۆڕ ( پستانک ).+

مەنجەنیق : ئاوری یەکجار زۆر.+

مەنی : ئاوی ڕەحەت بوون، شەهوەت.+

مێتوولە : ئەسپێی زۆر ورد، ڕشک.

مێچک : مێشک :( هێندەی گوتِ مێچکم چوو ).+

مێچکە : بریتی یە لە پیاوی تەبیات ژن، ژنانیلە.

میراودەلی : عەشیرەتێکن لە پشدەر لە کوردستانی عیراق.

مێرووڵەکردن : سەرەتای وەکوڵ هاتنی ئاو.+

میز : کووتی حەیوانی.+

میزاو : کووت دانی زەوی بەوە کە سەرانگوێلک بدرێتە دەم ئاو و بەسەر زەوی دا بلاو بکرێتەوە.+

میزاوکردن : ئیسهال بوونی مالاّت لە سەرەتای بەهاردا کە گیای شلک دەخوا و نیشانەی ئەوەیە کە گیاشینکە زۆر بووە.

میزاوشوتن : میزاو لێ شوتن، کووت دانی زەوی بە ڕێگای میزاودا.

میسکێن : هەژار، نەدار.

میسکێن : ڕەعیەت.

**مێشگرە** : باڵداریکە.+

**مێش لێ دان** : کرمێ بوونی بەری بێستان.

**میمڵ** : مڵە، دەعبایەکی بەزەرە نێو بێستان دەکێڵێ.

**مێوژە** ئەو دەنکە ترێ یانەی بە هێشووە ترێ یەکەوە وشک دەبن.

# پیتی ن

**نارنجه** : گۆرانی یەکی کوردی یە.

**نازە** : سووکەڵە ناوی نازدار.+

**ناسر** : ناوە بۆ پیاوان.+

**ناشتا** : چێشتەنگاو.

**ناوبوێر** : هەڵاواردنی یەکێک لە شتێک یان کارێک : ( *بێگاریی بە هەمووان کرێوە بێ ناوبوێر* ).+

**ناوپارە** : نێوپارە، دژی تەریک و چەپەک.+

**ناوخوان** : ناوچەیەکە لە کوردستان :( *خوایە لەم کەڵە زوو بمخەیتە بان ، بمخەیتە بەینی شلێر و ناوخوان* ).+ « فۆلکلۆر »

**ناودان** : ریزێک دەنکە گەنم کە لە گوڵەگەنمی زۆربە قەوەت دا پەیدا دەبێ.+

**ناوک کەوتن** : بریتی یە لە ترسان لە شتی لەنەکاو.+

**ناوک هاتنەوە** : بریتی یە لە ترسانی لەنەکاو.+

**نکوولی** : لاری، سەرپێچی، « مخالفت ».+

**نگادێری** : نگاداری، ئاگاداری.

نمەک تاڵ : ئەو کەسەی چاکە دەکا و خەڵک چاکەی لە چاو ناگرن.

نمەک سوێر : نمەک تاڵ.

نۆبەند : گایەکە نۆ ساڵ جووتی پێ کرابێ.+

نووسانەوە : گیرسانەوە.+

نوسک : نیسک، کەمێک، کەموسکەیەک.+

نۆکە زەردکە : نۆکەزەرکە.

نەبەگە : بێچووە ئاژەڵێک کە هێشتا ژەکی نەخواردوە.+

نەختەنەختە : ناوی گۆرانی یەکی کوردی یە.+

نەرمکە : گۆشتی نەرمەی بێ ئێسک.

نەرمەنەرمە : ناوی گۆرانی یەکی کوردی یە.+

نەقڵ : قسەی خۆشی بێکەنین هێن.+

نەقڵ : هۆمەن، پاڵ پێوەنان :( دایە بەر نەقڵان ).+

نەقورچ : نقورچک.

نەقورچک : نەقورچ.

نەگبەت : بەدفەڕ، بەدئەخلاق.+

نەگبەتی : بەدفەڕی.+

نەمام : ناوە بۆ ژنان.+

نەمام : داری ساوای دوو سێ ساڵە.+

نەمام ناشتن : چەقاندنی نەمام و داری تازە.

نەمرنەژی : ژیان بە هەژاری و دەسکورتی.

نەویس : نەبیس، نەبیست، بێ گوێ.

نیخە : دەنگی گەروو کە بە زەحمەت بێتە دەرێ.+

نیخەنیخ : نیخەی زۆر.

**نێرووکە** : خوڕایی چۆم، زۆرایی چۆم.

**نێرە** : نیرگە، کاریتە.

**نێرەکەر** : وەستای مەشکەی دار.+

**نێرەو** : زۆرایی چۆم، خوڕینی چۆم.+

**نیسان** : ٢٠ رۆژ لە خاکەلێوە و ١٠ رۆژ لە بانەمەڕ.×

**نێوبژە** : ددانی دووسالّی بۆ یەکسم.+

**نێوبەند** : نێوەڕاست.

**نێوبەدەرەوە** : بەناوبانگ.

**نێودار** : خەیار یان ترۆزی یەک کە دەنکی زۆر تێ دا بێ.+

**نێوەڕان** : نێوەڕ، نێو مێگەل.+

# پیتی و

وارش : دیواری وشکە کەڵەک بۆ هەر مەبەستێک.×

واغ : لێدانی زیاتر لە دانەیەک :( واغێن بە گوێز ، بە مازوو یان هەر شتێکی خڕ دەکرێ.بەڵام شەرتە کە کەللا هاوێژرا لانی کەم دوودانە بنگێوێ . ئەگینا کایە دەدرێتە دەستی حەریف ).×

واڵ : پارچەیەکی تەنکە هەر رەنگێک بێ نەک تەنیا پەمەیی.×

وردە : کا و گزرەی گێرە کراو، موقابیلی بە باقە بەستراو.+

ورشە : دەنگی تیژ تێ پەڕین :( *ورشەیەکی لێ هات و بە لام دا تێ پڕی* ).+

ورگن : بریتی یە لە زۆرخۆر.+

وڕمان : سەرسووڕمان.

وڕە : تەم وەژی سەرچیا لە زستان دا .+

وزە : دەنگی مێش.+

**وشکە** : بەشی نەزاوی مەڕومالاّت کە بە جیا دەکرێتە بەر شوان.+

**وشکەشیو** : ئەم دیو ئەودیو کردنی سەرپێچ بۆ ئەوەی دیوی خاوێنی دەرکەوێ.+

**وۆلە** : وشەی لێ خوڕین و دەنگ دانی گوێلک.+

**وەبەردان** : شتێک دانە بەر شتێک بۆ ئەوەی نەکەوێ : ( *کاریتە داهاتبوو، کۆڵەکەم وەبەردا* ).+

**وەبەرکەوتن** : لەبەرپاڕانەوە :( *زۆری وەبەر کەوتم لە گەڵم نەهات* ).+

**وەختاوەخت** : شەو ورۆژێکی تەواو :( *وەختاوەختێک ژانی برینەکەم نەشکا* ).+

**وەدین** : بەدین، دیندار.+

**وەرام** : مەرام، پێویستی :( *بۆ وەرامی کاری خۆی نەبێ ناشمان ناسێ* ).+

**وەربوون** : چوونی بێچووە گەڵ بۆ نێوڕان و مژینی شیری دایکیان بێ رازی بوونی خاوەن.+

**وەرتاخ** : شخەڵ، نەمامی ساوای داری جەنگەڵ.+

**وەرگیران** : قبووڵ کران لە مەدرەسە یان لە ئیدارە. مەفعوولیوەرگرتنە.×

**وەرگێڕانەوە** : بۆ جاری دووهەم وەرگێڕان.+

**وەرگێڵ** : ناوی گوندێکە لە ناوچەی رەبەت.+

**وەرێنان** : دەست تێ وەرێنان ، بە دەست دەورەدان : ( *دەستم دەقەدی وەرێنا* ).

**وزوزە** : جۆرێک قالۆچەیە کە دەڕوا و وزەوزی لێ دێ.

**وەز** : نیشانەی جنس :( نێرەوەز ، مێوەز ).+

**وەزەندی** : ئەزیەت و ئازار.

**وەستاخاڵە** : بنەماڵەیەکی ئاسنگەرن، بە هەموو ئاسنگەرێک ئاڵێن وەستاخاڵە.×

**وەستانەوە** : لێ ڕوانین :( دەستم برینی *لێ* پەیدابووە، *لێی وەوەستە داخوا* تێی دەگەی چیە ؟ ).+

**وەسەت** : جۆرێ تفەنگی بڕنۆیە.

**وەسەت** : ناوە بۆ ژنان.

**وەشان** : تەکان، لێکرانەوەی بەر :( گوێزەکان *وەشاون* )، ڕاوەشان.+

**وەشاندن** : بەری دار لێکردنەوە، ڕاوەشاندن :( گوێزەکانم *وەشاند* ).

**وەششە** : وشەی دەرکردنی کەر لە دەغڵ ودان یان هەر جێ یەک.×

**وەشەک** : وەرشەک، وەشەق، جانەوەرێکە لە تیرەی پڵنگ و بەور.×

**وەشێن** : هاوێژ :( دەست *وەشێن* ، *لووشک وەشێن* ).

**وەشێن** : ڕاتلەکێن، تەکێن :( *گوێزوەشێن* ).

**وەقا** : ماندووبوو ، تێ گیرا.+

**وەقان** : وەستان،ماندووبوون.

**وەقان** : تێ گیران، لێ نەزانین :( *نامەی دەخوێندەوە لە نێوەڕاستی دا وەقا* ).

**وەکردن** : کردنەوەی شتێک کە بەستراوەتەوە :( گرێ یەکە *وەکە، ئەسپەکە وەکە* ).

وەکردن : ئاگر کردنەوە، ئاگر هەڵکردن :( *ئاورەکە وەکە سەرمایە* ).

وەکردن : ئاوەلا کردنەوە :( *دەرگاکە وەکە* ).

وەلا : بەولاوە بچۆ.+

وەنجا : ئەمجار، دەی جا.

ویرەویر : دەنگی رۆیشتنی بەردێک کە هاوێژراوە.+

وێ کەوتن : لەبەرپاڕانەوە :( *زۆری وێ کەوتم لە گەڵم نەهات* ).+

وێڵ : عەودال :( *واچاکە بە جنێم بهێڵی ، هەرخۆم وێڵ بم لە شوێن خێڵی* ).+ « هەژار »

وێوڵ : نەوعێکدار بەڕوویە.×

# پیتی هـ

**ماتنەسەرچۆک** : بەزین نیە. ئەوەیە کە یەکێک بۆ جوابی کەسانی دیکە دێتە سەر چۆکان و بە لێبڕاوی قسە دەکا.×

**ماکوو** : هەربینا :( *ماکوو گەیشتە ئێرە* ).+

**مالاو** : لێ پێچراو :( *لاولاوی لە دار مالاو* ).+

**ماوارتەلەمن** : خراپت لێ قەوماوە، وەزعت خراپە.×

**ماوارتەلەمن** : تانووت لێدانە بۆ کەسێک کە بە ناهەق خۆی نەخۆش دەکا یان کاری لە دەست نایە.

**ماوارەلەمن** : وشەی کەسەر دەربڕین بۆ وەزعی خراپی گشتی یە :( *ماوارە لە من زستانەکەی سەختە کەس مالاتی بۆ نامێنێ* ).×

**ماواڵ منداڵ** : پزدانی ژن.

**ماوجا** : ژنی دووبرایان بۆ یەکتر.

**ماوجێ** : ژن بۆ مێرد و مێرد بۆ ژن.×

**ماولفانە** : ئاواڵ دووانە.

**مایدێ** : وشەیەکە بۆ دەرکردن دەگوترێ.×

هۆڕاندن : هۆڕەهۆڕ کردن.

هۆرمز : گیایەکی بەهاری یە سوور دەکرێتەوە و دەخورێ، بە گەورەیی مژمژیە، گۆزروان.

هوولاندن : دەنگی درێژی بنیادەم: ( دەروێش هوولاندی ).+

هۆڵە : میچی خانوو.

هۆڵە : ئەو دارە وردانەی لەسەر دارەڕاوە داوێژرێنە خانوو.×

هۆناو : هۆندراوە، بە بەنەوە کراو.

هۆیان : هۆگان.

هوێ ها : وشەی دەنگ دانی ئەسپ و ماین بۆ دەرکردن.

هۆی ها : هووی ها، وشەی سەرسووڕمان.

هەبرەش : لە تینوان وشک هەڵاتوو.+

هەرمن : تەنیا من.+

هەرمێشک : گۆشتی باش کوڵاو بە ئاوی کەمەوە.+

هەڕنین : ئەڕنین، چنین بە بێ سەرەوبەرەیی.+

هەژگ : لکەداری وشک کە قرژ وقاڵی پێوەبێ.×

هەژگەڵ : لکەدارێک کە بڕابێ و گەڵای بێوەبێ، وشک یان تەڕ.×

هەستان : زۆربوونی ئاوی ڕووبار.+

هەڵبەزینەوە : سڵەمینەوە.+

هەڵپەسێرراو : ئەو شتەی بە شتێکی دیکەوە پاڵ دراوە.

هەڵپەسێردراو : ئەوەی بۆ ماوەیەک وەلانراوە.

هەڵپەهەڵپ : پەلەپەل.+

هەڵپتاندن : ڕووت کردنەوە لە لیباس یان لە موو یان لە

گەلاولک.×

**هەلتووتەکان** : تەنیا بۆ سەگ و گورک و ریوی بەکار دیّ. جۆریک دانیشتنە کە قوونی لە سەر عەرزی یە و دەستی هەلپەساردوون.×

**هەلتۆزەلتۆز** : هەلبەزدابەز و لەگیران نەهاتن.

**هەلخوازتن** : هەلخواستن، لە سەرەوە داوا کردن :( *ئاوات هەلدەخوازم*).

**هەلداشتن** : لاریّ کردنی کەسیک بە ئەنقەست :( *ئەو کابرایەی بۆ کویّ هەلداشت ؟* ).+

**هەلدانەوە** : لەسەریەک کەلەکە کردن :( *ئەو هەموو گەنمەی هەلداوەتەوە کەچی دەلیّ نانی خۆم نیە* ).+

**هەلدران** : کۆکرانەوە :( *خەرمان هەلدران* ).+

**هەلدران** : ویّ کەوتن :( *شەق تێیهەلدران* ).+

**هەلدڕان** : لە خوارەوە بۆ سەریّ دڕان.×

**هەلدڕەلدڕ** : لە خوارەوە بۆ سەریّ زۆرجار دڕاو.×

**هەلسان** : رەپ بوونی ئالەتی پیاو.+

**هەلست** : هاتوچۆ:( *هەلستی زۆر لەسەرە* واتە خەلکی زۆر پێدا دەڕوا ).+

**هەلسوور** : بنیادەمی چالاک.+

**هەلقەنە** : لیکەرەوە :( *سەرەهەلقەنە*).

**هەلکران** : بەرەوژوور برانی ئالاّ :( *ئالاّ هەلکرا* ).+

**هەلکڕاندن** : شتیکی کەم لیزانین:( *شتیکم لیّ هەلکڕاندوە*).+

**هەلکشان** : بەرەوژوور چوونی نرخ :( *گەنم هەلکشاوە* واتە گران بووە ).+

هەڵکشاو : مەددە نیە، عەلامەتێکە وەک ( ا ) لە نووسینی عەرەبی دا دادەنرا :( كٓهيٰعصٓ ).×

هەڵگەڕان : رەنگ گۆڕان:( *سپی هەڵگەڕا، رەش هەڵگەڕا* ).+

هەڵگێڕانەوە : هەڵگرتن و دانانەوە :( *هەڵگێڕانەوەی بانی خانوو* ).+

هەڵنیشتن : نیشتنی پەلەوەر لە جێگای بەرز وەک دار و لیس .×

هەڵووچەقەیسی : قەیسی بەنەگەییوی.+

هەڵوەستە : وێستان و ئاوڕدانەوەیەکی کورت.

هەڵوێستە : هەڵوەستە.

هەڵە : کەسێک کە لە فکرێک دا بە غەڵەت چووە.

هەلیماو : شۆرباوی برنج یان بروێش.

هەڵیماو : هەلیماو.

هەمباز : ئەمباز، ئامباز، بەگژداچوو :( *هەمبازی بوو لە عەرزێی دا* ).+

هەمزەبەگی : بەرێکی دارمازوویە، نەک جۆرێک مازوو.×

هەنگڕان : ئەنگران، زیاد لە ئەندازە دەوڵەمەند بوون.

هەنگڵ : قوڵ، باسک :( *بن هەنگڵ یانی بن باسک* ).×

هەنووین : شێلان :( *پشتم دێشێ، کەمێکم بۆ بهەنووە* ).+

هەوت : گێژ :( *هەوت بووم* ).+

هەورامانی : جۆرێ نانی تەنک و نەرم کە بە سێڵ دەبرژێ.+

هەوربردە : بەرێکی دارمازوویە.+

هەورەبان : جۆرێ کڵاوڕۆژنەیە کە لە خوارەوە فراوانە و لە

سەریٚ چووک دەبیٚتەوە.+

**هەوری** : ناویٚکە بۆ ژنان.+

**هەوشینک** : هەوشەنگ، ئاژەڵی شیروشک کردوو پیٚش وەخت.

**هیٚس** : خوار، بۆ مل و بۆ دار و هەر شتیٚکی خوار بەکار دیٚ.×

**هیٚنانەوە** : ڕشانەوە :( هەرچی *خواردبووی هیٚنایەوە* ).+

# پیتی ی

| | |
|---|---|
| یەکبەر : | قوماشێکە لەسەر یەک قەد قەد نەکرابێ.× |
| یەکدەس : | یەکدەست، خاوێن، ناتێکەڵ.+ |
| یەک شەوە : | ئەوبەفرەی شەو باریوە و تۆز و خۆڵ بۆری نەکردوە ( هەروەختی ساڵ بارییێ ).× |
| یەک قسە : | بێ موعامەلە و چەند لێدان.+ |
| یەڵ گوان : | یەکەڵ گوان، ئەو بزن یان مەڕە کە گوانێکی خراپ بوویێ. |